# پێشبینییەکانی







عێل بەیگی جاف

خان ئەڵماس



دروێش وەجاخ

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: د. سدێق بۆرەکەیی (صفی زادە)

# پێش بینییەکانی

## عێل بەیگی جاف، خان ئەڵماس دەروێش وەجاخ گاوارەیی

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی:

د. سدێق بۆرەکەیی (صفیزادە)



وێنەی دوکتۆر بۆرەکەیی لە تاقی لاویدا

ایل بیگی جاف، ۸۹۸ق ـ ۹۶۱ق.
پێش‌بینی‌یه‌کانی / عێل بیگی جاف، (گردآورنده) صدیق بۆره‌که‌یی (صفی زاده)
سنندج بۆره‌که‌یی (صفی زاده).
۱۳۸۲ ـ ۱۰۹ص کردی ISBN 964 - 09 - 3302 - X
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا. واژه‌نامه. ۱ ـ شعر کردی ـ قرن ۱۰ق ـ تاریخ و نقد.
الف. صفی زاده، صدیق، ۱۳۲۲ ـ گردآورنده. ب. عنوان.
۹ الف ۲۴۳ آ/ ۳۲۵۶ PIR ۲۱۰۹/ ۹ فا ۸ ـ ۱۳۸۲ پ ۹۸۲ الف
کتابخانه ملی ایران ۱۱۲۶۲ ـ ۸۲ م

ناسنامه‌ی کتێب

■ ناوی کتێب: پێش‌بینی‌یه‌کانی:
عێل‌به‌گی جاف، ده‌روێش وه‌جاخ، خان ئه‌ڵماس
■ کۆکه‌ره‌وه و لێکوڵه‌ره‌وه:
د. صدیق بۆره‌که‌یی (صفی زاده)
■ ناشر: گردآورنده.
■ پیت چن: گۆران / سنه ۲۲۶۵۳۵۳
■ بلاوگه: گۆران / سنه
■ نه‌وبه‌تی چاپ: چاپی یه‌که‌م / ۲۷۰۳ی کوردی
■ هه‌ژمار: ۲/۰۰۰ به‌رگ
■ لیتوگرافی: قاسملو
■ شابک: ۹۶۴ ـ ۰۶ ـ ۳۳۰۲ ـ X
ISBN 964 - 09 -3302 - X

# پێش بینی یەکانی

## عێل بەیگی جاف

کۆکردنەوە و ئامادە کردنی: د. سدێق بۆرەکەیی



وێنەی خەیاڵی عێل بەیگی جاف کە بە قەڵەمی هونەرمەند کاك هادی زیائەدینی کێشراوە

بسم‌الله‌الرحمن‌الرحیم

# سەرەتا:

ئەم پەڕتووکە کە بریتی‌یە لە پێش‌بینی‌یەکانی سێ هۆنەری هەرەبەرزی کورد: «"عێل‌بەگی"جاف، خان ئەلماسی لوڕستانی، دەروێش وەجاخی گاوارەیی» هەر سێ‌یانی لە ساڵەکانی دوایی‌دا چاپ و بڵاو بووەتەوە و لەبەر ئەوەی ماوەیێک بە سەر ئەو پەڕتووکانەدا تێ‌پەڕیوە و نوسخەکانی بە دەستەوە نەماوە و خەڵکیش حەز لە خوێندنەوەی ئەکەن ئەوە بوو بە پێی پێشنیاری کاک حەسەن گۆران بەرپرسی بڵاوگەی گۆران لە شاری سنە کە تا ئێستا خزمەتێکی زۆری کردووە بە فەرهەنگ و زمانی کوردی بڕیارم‌دا کە پێش‌بینی‌یەکانی ئەو هەرسێ هۆنەرە لە بەرگێک‌دا چاپ و بڵاو بکرێتەوە تا هەمووی خوێندەوارانی بەڕێز و هێژای کورد کەڵک و سوودی لێ وەرگرن.

لێرەدا:

**پێویستە سپاسی خۆم ئاراستەی کاک «حەسەن گۆران» بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە بکەم و هەروەها سپاسی خوشکە «شانازی عەبدڵڵاهی» خێزانی بۆ پیت چنینی ئەم پەڕتووکە بکەم.**

تاران - مانگی خاکەلێوە ١٣٨٢

سدێق بۆرەکەیی

## پێشەکی:

هۆنەری رووناکی رەوانی کورد کە ناوەرۆکی هۆنراوەکانی لە چۆنیەتی رووداوی ئایندەوە ئەدوا، لە رۆژگاری ژیانیدا خەڵک ئەویان بە شێت و دێوانە ئەزانی و هۆنراوەکانیان بە پڕوپووچ وڕاوە دائەنا، کەچی ئەو هۆنەرە لە راستەقینەدا رەوانێکی پاک و ئاگای بووە و بە چاوی نهێنی چۆنیەتی رۆژگاری ئایندەی بینیوە، وەها کە لە سالانی لە شوێن یەکی دوای رۆژگاری ئەو بوێژە تا ئێستا کە نزیکەی پێنجسەد ساڵ تێ ئەپەڕێ چینەکانی پێش لە ئێمە یەک لە شوێن یەک ئەو رووداوانەیان کە ئەو هۆنەرە پایەبەرزە پێش‌بینی کردبوو چاو پێ کەوتووە، وە بێ گومان پێش‌بینی یەکانی تریشی لەمەولا چینە دوایی یەکان ئەیانبینن، هەندێ لەو پێش‌بینی یانە ناوەڕۆکیان ئاشکرا و هەندێ‌تری بە گۆشەو پلار لە قالبی هۆنراوەدا دارشتووە.

ئەو هۆنەرە ناوی عێل‌بەگی یە کە بە نازناوی «جاف» ناوبانگی دەر کردووە کەمتر کەسێک هەیە لە وێژەوانانی کورد کە ناوی «"عێل‌بەگی"جاف»ی نەبیستبێ "عێل‌بەگی"بە پێی ئەو بەڵگانەی کە لە دەست‌دایە لە ساڵی ٨٩٨ی کۆچی لە شارەزوورا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و لە ساڵی ٩٦١ لە تەمەنی ٦٣ ساڵی‌دا کۆچی دوایی کردووە. لە یەکێ لە دیوانە دەستنووسەکانی عێل‌بەگی‌دا هاتووە کە "عێل‌بەگی" ٨٥٨ ساڵ پاش هافی عەلی لە دایک بووە و ٦٣ ساڵ ژیاوە. هەروەها ئەزانین کە هافی عەلی لە ساڵی ٤٠ی کۆچی داکوژراوە، کەوابوو لە دایک بوونی "عێل‌بەگی" ئەبێتە ساڵی ٨٩٨ و مردنیشی لە ساڵی ٩٦١ی کۆچی‌دا رووی داوە.

مامۆستا علائەالدینی سەجادیش لە مێژووی ئەدەبی کوردی کە لە ساڵی ١٣٧١ی کۆچی‌دا لە چاپی داوە ئەڵێ: وەکوو ئەڵێن "عێل‌بەگی" چوار سەد ساڵ لەمەوپێش ژیاوە. فەتالی حەیدەری لە «دیوانی مەلا پەرێشان» کە لە ساڵی ١٣٣٥ی هەتاوی‌دا لە چاپی داوە ئەڵێ: عێل‌بەگی‌جاف گەلێ بەر لە خول و رۆژگاری نادرشادا ژیاوە.

ئەوەی کە بۆ ئێمە سەرنج راکێشە ئەوەیە کە "عێل‌بەگی" لەگەڵ ئەوەی کە یەکێ لە

یارسانەکانی دەور و بەری سیروان بووە و زۆربەی پەڕاوە ڕەوشتی یەکانی یارسان بە زاراوەی گۆرانی هۆنراوەتەوە ئەو هاتووە بە زاراوەی کرمانجی باشووری (سۆرانی) هۆنراوەکانی خۆی هۆنیوەتەوە. ئەڵبەت ناتوانین بڵێین ئەو ئەم ڕچەیە شکاندووە. چونکە بەر لە ئەوگەلێ لە هۆنەرانی کوردی یارسان بە زاراوەی کرمانجی باشووری هۆنراوەیان هۆنیوەتەوە. بە تایبەت «ئەحمەدی کەرکووکی» لە سەدەی شەشەمی کۆچی و «عابدینی جاف» و هەندێ لە هۆنەرانی تر لە سەدەی هەشتەمدا ئەم ڕچەیانە شکاندووە و هۆنراوەیان بە زمانی زگماکی خۆیان داناوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە زاراوەی گۆرانی یان بەلاوە زاراوەیێکی ڕەوشتی و پیرۆز زانیوە.

"عێل بەگی" لە هۆنراوەکانی دا بە فەرمانڕەوایی نادر هەوشار (١١٤٨ - ١١٦٠ی کۆچی) و زەندی یەکان (١١٧٢ - ١٢٠٩ی کۆچی) و قاجاری یەکان (١٢٠٩ - ١٣٤٤ی کۆچی) و پالەوی یەکان) ١٣٤٤ - ١٣٩٩ی کۆچی) و هەروەها لە بەدی هاتنی فڕۆکە و ماشین و برووسکە و شەڕەکانی جیهانی و ڕووداوە تازەکان و گەلێ شتی نادیار و شاراوەو شتانی تریش کە لەمەولا ڕەنگە بێنە دی و چینە دوایی یەکان ببینن دیاردی یەی کردووە.

ئەبێ ئەوەش بزانین کە پێش بینی و پێشگویی هەر لە مێژەوە لە ناوی ئێرانی یەکان دا باو بووە و بەشێ لە وێژەی زەردەشتی بریتی یە لە پێش بینی، بە تایبەت پەڕاوی «زەندو و هوومەن یەسن» و «دینکەرد» و «بوندهشن» و «زەردەشت نامە» و «جاماسپ‌نامە» پڕە لە پێش بینی.

لە هەندێ لە پەڕاوەکانی ئیسلامیش دا وەکوو «مظاهرالانوار» و «حلیةالمتقین» و «نجم الثاقب» و «تبصرة العوام» گەلێ پێش بینی تێدا ئەبینرێ کە زۆربەی ئەو پێش بینی یانە لە پێغەمبەری گەورەی ئیسلام دروودی خوای لە سەربێ و هەروەها لە ڕابەر و پێشەواکانی ئیسلام گێڕڕاونەتەوە. لە ئایینەکانی تریش وەکوو ئایینی جوولەکە و فەلە و بوودایی و هەندێ لە ئایینەکانی تر پێشگویی هەیە.

ئەوەی کە جێگای ورد بوونەوەیە ئەمەیە کە ئەگونجێ ئەو پێش بینی یانە لە

رۆژگارگەلێکا، هەندە کەسێ دەستیان بردبێتە ناویانەوە و هەندە شتێکیان لەوان زیاد و کەم کردبێ و لەگەڵ ڕووداوەکانی ڕۆژگاری خۆیان یا ڕابردوودا بەرانبەر کرد بێ، بەڵام ئێمە بە پێی لێکۆڵینەوەیێ کە کردوومانە ئەتوانین بڵێین پێش‌بینی‌یەکانی "عێل‌بەگی" بەلای زۆرەوە لەو دەست لێ‌دانە دوورن، چونکە پێش‌بینی‌یە دەستنووسەکانی عێل‌بەیگی زۆربەیان بە دەیان ساڵ بەر لە ڕووداوەکان نووسراونەتەوە، وە ئەمەش ئەو بەڵگەیەمان ئەخاتە دەست کە ئەو پێش‌بینی‌یانە دەستیان نەخواردبێ.

لە پێش‌بینی‌یەکانی "عێل‌بەگی" چوار نوسخەی دەست نووسم لە دەوروبەری کرماشان و هەوشارداکەوتە دەست کە هەرکام لەو نوسخانە نارێکی و ناتەواوێیکیان هەبوو، بەڵام لە ناوی ئەو چوار نوسخەدا زۆرتر پشتم بە نوسخەی فەرەیدوونی پالیزی‌یەوە بەست کە لە ساڵی ١٢٧١ی کۆچی نووسراوە و بۆ ئەم نوسخە (ا)م کردووە بەنیشانەی و جیاوزی‌یەکانم لەگەڵ ئەوسێ نوسخەکەی تر لە پەراوێزەکەی دا نووسیوە. نوسخەی دووهەم بە پێنووسی کاکاردایی کەیە کێ لە نووسەرانی یارسانە و لە ساڵی ١٣٢٥ی کۆچی نووسراوە، (ب)م کردووەتە نیشانەی. نوسخەی سێهەم بە پێنووسی موحەممەدی لواوبەری لە ساڵی ١٣٤٣ی هەتاوی نووسراوەو (پ)م کردووەتە نیشانەی. نوسخەی چوارەم کە لە ساڵی ١٣٤٦ی هەتاوی نووسراوە، نووسەرەکەی ناوی خۆی نەنووسیوە و (ت)م کردووەتە نیشانەی.

لە دوایی‌دا ئەمەوێ دەستە و داوێنی خوێنەرە بەڕێز و دڵسۆزەکانی کورد بم و تکایان لێ بکەم کە ئەو دەستنوسە کوردیانەی کە لایانە و چاپ نەکراوە، بۆمانی بنێرن تا لە چاپ بدرێن و ئیتر باکەم کەلەپووری دێرینمان مۆریانە بیخوا و لە ناو بچێ.

تاران ١٣٥٩ - سدیق بۆرەکەیی

## وتەیەک:

مەبەستێ کە لێرەدا ئەبێ بیڵێم ئەوەیە پارە کە چوومە شاری پیرۆزی سلێمانی، لەوێدا لە یەکێ لە کتێب فرۆشەکاندا چاوم کەوتە پێش‌بینی‌یەکانی عێل‌بەگی جاف کە بیست ساڵ لەمەوپێش بە هەزار ئەرک و کێشە چاپ و بلاۆم کردبوو کەچی پیاوێک بە ناوی بەختیار غەفوور هەڵەبجەیی بە ژمارەی سپاردنی ١٢٨ لە ساڵی ٢٠٠٢دا ئەو نووسراوەی بە دەق بە ناوی خۆیەوە لە چاپ دابوو بە بێ‌ئەوەی وشەیێکی بگۆڕێ و سەرسووڕمان لەوەدایە وێنەی سەربەرگەکەی کە خۆم کێشابووم، وگەلێ دەسخەتی ناو نووسراوەکەشی هەروا بە دزی‌یەوە ئۆفسێتی کردبوو. بەڕاستی ئەمە جێی داخ و موخابنە کە پیاوێکی هەڵەبجەیی دەست بداتە ئەم کارە ناشیرینە چونکە شاری هەڵەبجە هەر لە مێژەوە کانگای وێژە و فەرهەنگی کوردی بووە تایەربەگی جاف و ئەحمەد موختار بەگی جاف و گۆران و دەیان هۆنەر و زاناتری لێ هەڵکەوتووە کە پەرەیان داوەتە فەرهەنگ و زمانی کوردی کەچی ئێستا هەندێ وەکوو ئەو چەشنە کەسانە هەلیان بۆ هەڵکەوتووە و بە دزی‌یەوە شوێنەواری خەڵک بە ناوی خۆیانەوە لە چاپ ئەدەن. ئەوەی کە لە هەموو شتێ پتر ئازارمی دا ئەوەیە کە گەلێ هەڵە و پەڵە کەوتبووە ناو هۆنراوەکان، بۆیە دیسانەوە دەستم کردە چاپ کردنی ئەم نووسراوە تا بە بێ هەڵە بگاتە دەستی خوێندەوارانی بەڕێز و هێژای کورد و ئیتر ئەوا ئێوە و پێش‌بینی‌یەکانی عێل‌بەگی جاف بۆ چوارەمین جار.

تاران - مانگی خاکەلێوەی ١٣٨٢

سدێق بۆرەکەیی

# (١)

من بە قەولّی گۆران دەکەم قسە لە ژێر هەوران دەکەم

هەمووی لە بۆ سۆران دەکەم ئیتاعەتی دەوران دەکەم

هەروا بووە و هەروا دەبێ (١)

---

١ ـ واتە: من بە پێی وتەی گۆران ئەجوولێمەوە بە پێی قسەی پیاوە گەورەکانی ئەم عێلە مژ لە ژێر هەور دەردێنم و رازی نهێنی و شاراوە ئاشکرا ئەکەم تا ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ کوردی سۆران و کەلّکی لێ وەرگرن و ئاگایان لە داهاتووەکانی خول و دەوران بێ، هەروەها کە من ئاگام لە گۆرانی چەرخ و زەمان هەیە، ئەم رەوشتە بەر لە ئێمە بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

وشەی "گۆران"کە لە خشتەکی یەکەمدا هاتووە بریتی‌یە لە عێلی گۆران کە لە خۆر ئاوای کرماشان و شوێنەکانی تری کوردستان‌دا نیشتەجێن و داگری شەش تیرەن بە ناوانی: "قەلّخانی، بیبیانی، نەیرێژی، گاوارە، کانی‌زنجیری، رێژەهو. گۆرانەکان پەیرەوی رێ و رچەی یارسانن و بە یەکێ لە شێوەکانی گۆرانی ئەدوێن و گەلێ هۆنەریان لێ هەلّکەوتووە کە راژە و خزمەتی وێژەو زمانی کوردی‌یان کردووە.

وشەی "سۆران"کە لە خشتەکی سێهەمدا هاتووە بریتی‌یە، لە عێلی سۆران کە لە مێژدا لە دەور و بەری هەولێر و هەریر و رەواندز و شەقلاوەدا ئەژیان و پاشان ئەم عێلە دەولّەتێکیان بە ناوی سۆران دامەزران.

"سۆران" لە [illegible]ژوودا بریتی‌یە لە ناوچەی هەردوو زاب و بووەتە ناو و نیشان بۆ کوردەکانی ئەوێ. مێژوونووسان ئەلّێن کەولّوس ناوێک لە سەدەی نۆهەمی کۆچی‌دا هاتووەتە هەرێمی هەولێر و لە ناوچەی "ئاوان"دا ناوبانگی دەرکردووە و یەکێ لە کورەکانی بە ناوی عیسا لە هەراینێکا سەرکەوتووە و بووەتە سەردار و بە ناوی جێگای شەرەکە ناوبانگی "سۆران"ی بۆ ماوەتەوە. جا دەولّەتی "سۆران" ئەم عیسا پێکەوەی ناوە و لە پاش خۆی کورەکەی بووەتە

# (٢)

ئەوسا ئـەدای وەفـا دەکـەم        سەرم پڕ شۆڕ سەودا دەکەم
هەر تـەماشای دنـیا دەکـەم        ڕوو بە تووری سـینا دەکـەم
هەڕوا بووە و هەروا دەبێ (٢)

---

جێنشینی. لە دەوری سلێمان بەگی سۆراندا، خـەڵک کـەوتووەتە نـاو خـۆشی و زانست وێژەی کوردیش پەرەی سەندووە. پاشان "خانزاد" خوشکی سلێمان بەگ ولاتەکەی بەڕێوە بردووە، وە لە دوای خانزاد عەلی بەگ لە ساڵی ١٢٠١ی کۆچیدا بووەتە جێنشینی. دوایین میری سۆران، حەمە پاشاکوێرەی ڕەواندزەکە تـا سـاڵی ١٢٣٥ی کـۆچی فـەرمانڕەوایـی کردووە و بەگەورەترین میری سۆران ئەژمێرێ. سنووری ولاتی سـۆران تـا دەوروبـەری سەردەشت و بانە و سابلاخ ڕۆیشتووە. قۆچکە سۆرانی کە بۆ کراس ئەیدوورێنن، و لە نـاو کوردانیدا باوە یادگاری ئەم عێلەیە.

٢ ـ واتە: ئەوسا ئەمەگ ئەکەمە بەرنامەی خۆم و بە سینەیێکی پڕشۆر و دڵـێکی پـاک و خاوێن و سەرێکی پڕ لە ئەوین سەرنجی جیهان و خەڵک ئەدەم و وەکوو مووسا ڕوو ئەکەمە تووری سینا و ڕازە نهێنییەکانتان بۆ ئەگێڕمەوە. ئەم ڕەوشتە بەر لە ئێمە بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

"عێل‌بەگی" لێرەدا دیاردەی کردوەتە کێوی تووری سینا کە هافی مووسا لە گـەڵ خـوا لەوێدا ڕاز و نیازی ئەکرد. سینا ناوی گەزیرەیێکە کە کەوتووەتە نێوانی زریەی مدیتەرانە و کاناڵی سوئیز و فەلەستین و ئاودرگەی عەقەبە.

"توور"یش ناوی کێوێکە کە لە دەشتی سینا دایە. مووسا لە گەڵ پەیرەوانیدا ڕێگەی ولاتی کەنعانی گرتە بەر و لەوێوە چووە کێوی تووری سینا و دە فەرمانی لە لایەنی خواوە وەرگرت و گەیاندیە پەیرەوانی خۆی.

بەڵام جوولەکەکان وازیان لێ نەهێنا و هەموو دەم پەڵپ و بیانوویان لێ ئەگرت و ئەویش

## (٣)

ئـێران پـڕ لە ئـاگـر دەبـێ حوکمی سوڵتان قاهر دەبـێ
ستەم لە خـەڵق سـادر دەبـێ دەورە دەورەی نـادر دەبـێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ (٣)

---

بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکانی خەڵک ئەچووە سەر کێوی توور لەگەڵ خوا دا وت‌و وێژی ئەکرد و ئەگەڕایەوە ناو خەڵک. سەرئەنجام مووساکەوتە بیری ئەوەکە خوا ببینێ و بۆ ئەم مەبەستە چووە کێوی توور و وتی: "رَبِّ أرنی أنظُر اِلیکَ" یانێ: خوایا خـۆت دەرخـە تـا بتبینم. خوایش فەرمووی: "لَن تَرانی وَ لِکن انظُر اِلی الجَبَلِ فاِن استَقَرَّ مَکانَهُ فَسَوف تَرانی" واتە: تۆ هەرگیز ناتوانی بمبینی. بەڵام بە کێوەکە بڕوانە ئەگەر لە جێی خۆیا ما ئـەوا تـۆش ئەمبینی. لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کـە کـاتێ خـوا خـۆی دەرخست، کـێوەکـە هـەپروون هەپروون بووەوە و مووسایش بێهۆش کەوت و کاتێ هاتەوە سەر خۆی داوای لێ بووردنی لە خوا کرد.

٣ ـ واتە: ئێران پڕ لە ئاگری شەڕ ئەبێ و بە فەرمانی شا هەموو شوێنێ وێران و خاپوور ئەبێ و خەڵک ژیان بە زەبر و زەنگ ئەبەنە سەر تا نادر ناوێ پەیدا ئەبێ. دنیا هەر وا بووەو هەر واش دەبێ.

"عێل‌بەگی" لێرەدا دیاردی ئەکاتە رۆژگاری فـەرمانڕەوایـی نـادرشای هـەوشار کـە لە ١١٤٨ ـ ١١٦٠ ی کۆچی " فەرمانڕەوایی کردووە و عوسمانیەکان و ئەفغانیەکانی شکست داوە و لە ساڵی ١١٥١ ی کۆچی دا هێرشی بردووەتە هندوستان و ئەو وڵاتەی داگیر کردووە و گەڕاوەتەوە. ئەم پاتشا وەکوو پادشاکانی‌تر گەلێ ستەمکار بووە و گەلێ لە عێلە کوردەکانی کرمانجی لە کوردستانەوە کۆچاندووەتە خوراسان و ئەوانی لە زێد و مەڵبەندی خۆیان ئاوارە و دەربەدەر کردووە و پاشان هەر ئەو عێلە نەبەزانە لە بەرامبەری زەبـر و زەنگـی نـادرشادا راپەڕیون و ئەویش لە ساڵی ١١٦٠ کۆچی بۆ تەمێ کردنی ئـەم کـوردانـە بـە لەشکـرەوە

## (۴)

خـاسان وه بـیٚ وه‌تـه‌ن ده‌بـیٚ        مورغان دوور له چه‌مه‌ن ده‌بیٚ
شـاهان وه بیٚ کـه‌فه‌ن ده‌بـیٚ        ده‌وران وه کـامی زه‌ن ده‌بـیٚ
هه‌روا بووه و هه‌روا ده‌بیٚ (٤)

---

چووه‌ته سه‌ریان، به‌ڵام له ریٚ داکوژراوه و به‌م ئاواته پیسه‌ی نه‌گه‌یشتووه. له پاش کوژرانی نادرشا ئیٚران شیٚواوه وکوڕه‌که‌یان ناوه‌ته سه‌ر ته‌خت تاکه‌ریمخانی زه‌ند راپه‌ڕیوه و بنه‌ماڵه‌ی هه‌وشاری پووچ کردووه‌ته‌وه.

ئه‌م هۆنراوه ئه‌وه‌مان بۆ ده‌رئه‌خاکه رۆژگاری ژیانی "عیٚل‌به‌گی "گه‌لیٚ به‌ر له رۆژگاری فه‌رمانڕه‌وایی نادر بووه و ئه‌گونجیٚ له رۆژگاری فه‌رمانڕه‌وایه‌تی سه‌فه‌ویه‌کانا ژیابیٚ و ئه‌م پیٚش‌بینی‌یانه‌ی وتبیٚ.

۴ ـ واته چاکان ده‌ربه‌ده‌ر ئه‌بن و به بـیٚ نـیشتمان ئـه‌میٚننه‌وه و پـه‌له‌وه‌ران له مـیٚرگ و چیمه‌ن دوور ئه‌بنه‌وه و فه‌رمانڕه‌وایان و شایان به بیٚ کفن ئـه‌مرن و کـه‌س هـه‌واڵـیٚکیان لیٚ ناپرسیٚ و ئه‌وسا چه‌رخی ده‌وران له ئیٚراندا به کامی بـنه‌ماڵه‌ی «زه‌نـد» ئـه‌سووریٚته‌وه. ئـه‌م ره‌وشته به‌ر له ئیٚمه به‌م چه‌شنه بووه و دوای ئیٚمه‌ش هه‌ر به‌م چه‌شنه ئه‌بیٚ. له‌م هۆنراوانـه‌دا دیاردی‌یه ئه‌کاته خولی فه‌رمانڕه‌وایه‌تی زه‌ندی‌یه‌کان که له ۱۱۷۲ تا ۱۲۰۹ی کۆچی له ئیٚرانا فه‌رمانڕه‌وایه‌تی‌یان کردووه.

"زه‌ند" یه‌کیٚ له عیٚله‌کانی (له‌ک)ه که له لورستاندا ئه‌ژین، دامه‌زریٚنه‌ری ئه‌م بنه‌ماڵه که‌ریم خانی (زه‌ند)ه که پیاویٚکی دڵپاک و لیٚبوردو و ئازا و به‌جه‌رگ و دادگه‌ر بووه و ئیٚرانـی له بشیٚونه رزگار کردووه و ناوی خۆی ناوه (وکیل الرعایا) و پاشان شاری شیرازی کـردووه‌ته پایته‌خت و له‌شکریٚکی پڕ چه‌کی پیٚکه‌وه ناوه و زۆربه‌ی له‌شکره‌که‌ی له عیٚله‌کانی کـورد بووه. که‌ریم خان گه‌لیٚ بایه‌خی داوه‌ته کشت وکاڵ و ئاوه‌دانی و به‌م چه‌شنه ئیٚران له زه‌مانی ئه‌وا به جاریٚ ئاوه‌دان بووه‌ته‌وه و خه‌ڵک که‌وتووه‌ته ناو خۆشی. ئه‌م پیاوه دڵپاک و نه‌به‌زه له

# (٥)

دەوران بە دەست قەجەر دەبێ       تەیموو لە خەو خەبەر دەبێ
گەلێ سەران بێ سەر دەبێ       ئاشووب و شۆر و شەڕ دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٥)

---

ساڵی ١١٩١ی کۆچی لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و خەڵک بە جارێ بۆی بە پەرۆش بوون. لە دوای کەریم خان چەند میری تری زەند فەرمانڕەواییان کردووە تا لە ساڵی ١٢٠٩ کۆچی قاجاری‌یەکان ئەم بنەماڵەیان بە جارێ تەفر و توونا کرد.

٥ ـ واتە: پاش دەورانی فەرمانڕەوایەتی زەندیەکان، قەجەرەکان فەرمانڕەوایەتی ئەگرنە دەست و ئەمانە ئەوەندە زەبر و زەنگ و ستەم ئەنوێنن کە تەیمووری لەنگ لە خەو وریا ئەبێتەوە و پێی شاد ئەبێ، ئەوندەش لاشە بێ سەر ئەبێ و بشێوی و شەڕ و شۆر دائەمەزرێ کە لە ژماردا نایێ، جیهان بەر لە ئێمە بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

لێرەدا دیاردی ئەکاتە سەر قاجاری‌یەکان کە لە ١٢٠٩ ـ ١٣٤٤ی کۆچی بۆ ماوەی ١٣٥ ساڵ بە سەر ئێرانا فەرمانڕەوایی‌یان کردووە و بە هۆی لێ نەهاتوویی فەرمانڕەوایانی ئەم زنجیرە گەلێ لە شارەکانی ئێران بە تایبەت بەشێ لە ئازەربایجان کەوتە ژێر دەسەڵاتی رووسەکان و ئێران بە جارێ کەوتە ناو شپرزە و ئاژاوە. ئەم قاجاریانە لە بنەڕەتا یەکێ لە عێلەکانی مەغوول بوون و موحەممەد خانی قاجار لە ساڵی ١٢٠٩ی کۆچی بنەماڵەی زەندی‌یەکانی لە ناو بردووە و خۆی چووەتە سەر تەخت. لە پاش ئەو هەندێتر هاتوونەتە سەر تەخت و خەریکی چەوساندنەوەی خەڵکی ئێران بوون و بە زەبر و زەنگ و ستەم وڵاتیان بردووەتە رێوە و وڵات بە جارێ کەوتووەتە ناو ئاژاوە و شەڕ و شۆڕ.

"عێل‌بەگی" لە خشتەکی دووهەم دا دیاردی ئەکاتە تەیموور کە مەبەستی ئەمیر تەیمووری گورەکانی (٧٧١ ـ ٨٠٧ی کۆچی)یە کە بە تەیمووری لەنگیش ناسراوە و گەلێ لە وڵاتەکانی بە زۆری شمشێر داگیر کردووە و سەمەرقەندی کردووەتە پایتەختی خۆی. ئەمیر

## (٦)

جیهان پڕ لە غەوغا دەبێ      ئەداکەرێ پەیدا دەبێ
مونکر گەلێ ریسوا دەبێ      فتنەو شەری بەرپا دەبێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ (٦)

---

تەیموور ئەگەیشتە هەر شوێنێ، ئەو شوێنەی بە جارێ وێران ئەکرد. وە یا ئەیسووتاند و خەڵکەکەی ئەکوشت و سامان و دارایی یەکەشیان بە تالان ئەبرد و دەستووری ئەدا سەری ئەو کەسانەی کە ئەکوژران ببڕن و منارەی لێ درووست کەن. بە جۆرێ کە مێژوونووسان گێڕاویانەتەوە لە دهلی‌دا منارەیێکیان لە سەری ١٠٠ هەزار کوژراو و لە بەغدادا لە ٩٠ هەزار کوژراو و لە ئەسپەهان‌دا لە ٧٠ هەزار کوژراو دروست کرد، وە لە سەبزەواردا دوو هەزار کەسیان بە زیندوویی نایە چینی دیوار. ئەمیر تەیموور لە پەلامارەکەیا بۆ سەر بەغدا لە رێگەی کوردەواریەوە تێ‌پەڕیوە و کوردەکان لە بەرامبەری سپاکەیا راوێستان و گەلێکیان لێ کوژراوە و گەلێ زیانیان لێ کەوتووە.

جا "عێل‌بەگی" لە هۆنراوەکەیا ئەڵێ: قاجاری‌یەکان ئەوەندە ستەم لە خەڵک ئەکەن و لە دەوری ئەوانا ئەوەندە خەڵک ئەکوژرێ و لاشە بێ‌سەر ئەبێ کە رەوانی تەیمووری پێ شاد ئەبێ.

٦ ـ واتە: جیهان پڕ لە غەوغا و هەنگامە ئەبێ و ئەداکەر و کارسازێ پەیدا ئەبێ و بەم شەڕ و کێشانە کۆتایی دێنێ و خراپکاران و شەڕ هەڵگیرسێنەران بە سزای خۆیان ئەگەیێنێ، ئەم رەوشتە بەر لە ئێمە بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

## (٧)

نیوەی ئێران هی رووس دەبێ      ئەوەی هیچ بێ ناموس دەبێ
ئـەوسا زەڕیـان لە مس دەبـێ      دین و ئیمان زۆر سس دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ [٧]

## (٨)

شـۆڕش لە ئـێرانـی دەبـێ      سەرێ جۆش و گرانی دەبـێ
گـەلێ مـەردان فـانی دەبێ      رفـی دۆسـتی گـیانی دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ [٨]

---

٧ ـ واتە: رووس نیوەی ئێران داگیر ئەکا و لەم رۆزگارەدا خەڵک کەمتر گوێ بە ناموس ئەدەن، دین و بڕواش لە لایان سس وکز ئەبێ و پووڵ و پارەیان لە مس لێ ئەدەن و ژیان لە بێ بڕوایی‌دا ئەبەنەسەر. رەوشتی جیهان بەم‌چەشنە بووەو دوای ئێمەش هەر بەم‌چەشنە ئەبێ.

"عێل‌بەگی" لەو هۆنراوانەدا دیاردی‌یە ئەکاتە شەڕەکانی ئێران و رووس کە لە زەمانی فەتالی شای قاجار لە ساڵی ١٢٤١ و ١٢٤٣ی کۆچی‌دا رووی داوە و لەم شەڕانەدا سپای ئێران چەند جار تێ‌شکاوە بە هوێ بڕیارنامەی نـەنگینی تـورکمان چـای‌یەوە، ئـێرەوان و نەخچەوان و بەشێ لە دەشتی موغان تاکەوشەنی رووباری ئارێز درایە دەوڵەتی رووس و بەم چەشنە بەشێ لە ئێران کەوتە ژێر دەسەڵاتی رووسەکان.

٨ ـ واتە: لە ئێران‌دا شۆڕش و بزووتنەوە پەیدا ئەبێ و هەمووی خەڵک یەک ئەگرن ئـەم بزووتنەوە دێننە دی، بەڵام پاشان ئەبێتە گرانی و قاتی و قڕی و گەلێ خەڵک لە ناو ئەچێ و رفی دۆستی گیانی ئەبێ. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

## (٩)

چابووک سوواریێ دەنگ دەکا سەید و شکار پەڵەنگ دەکا
هەر ساعەتێ سەد رەنگ دەکا دنیا و خەڵق پڕشەنگ دەکا
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٩)

## (١٠)

مەردان مەردی گەزاف دەکەن هەم بە راستی خەلاف دەکەن
قسان بە تیر قەلاف دەکەن بە رێگەی دوور مەساف دەکەن
هەروا بووە و هەروا دەبێ (١٠)

---

لێرەدا دیاردی ئەکاتە شۆڕش و بزووتنەوەی گەلی ئێران کە لە زەمانی (مظفرالدین شا ١٣١٣ - ١٣٢٤ی کۆچی)دا بە هۆی سەتارخان و یارانیەوە رووی دا، وە لە ئازەربایجان و زۆربەی شارەکانی تری ئێران‌دا بزووتنەوە و شۆڕش دەست پێ کرا و سەرئەنجام فەرمانی (مشروطە) لە لایەنی شای ناوبراوەوە مۆر کرا. میرزا مەحموود خانی ئەمیر توومانی دەوەلوو لە یادداشتەکانی خۆی دا ئەڵێ: لەم رۆژگارەدا ئێران کەوتە ناو گرانی و قاتی و قڕی و شەڕ و شۆر و خەڵک ژیانیان بە چەرمەسەرێ ئەبردە سەر و تەنانەت لە بەر برسیەتی لە گۆشتی وڵساتی درندەش لایان نەئەدا و هەرکەسێ بە بیری تێر کردنی زکی خۆیەوە بوو.

٩ ـ واتە: شۆڕەسواریێ ئەگەیێتە هانای ئەوان و پڵنگ خوویان و ستەمگەران نێچیر ئەکا و هەر دەمێ بە سەد رەنگ خۆی ئەنوێنێ و هەمووی خەڵکی جیهان شادمان ئەکا و هێمنی ئەوان دێنێتە دی. ئەم رەوشتە هەر بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە دەبێ.

١٠ ـ واتە: مەردان و پیاوی ناپیاوان گەزاف و درۆ ئەکەن و لە رێی راست لائەدەن و قسان بە هۆی تەلەوە لە رێگەی دوور بە یەک ئەگەیێنن و پیلانبازی و رامیاری لە وڵاتدا بڵاو ئەبێتەوە و پەرە ئەستێنێ.

## (١١)

گـەلێ دڵـم بـە تـەنگ دەبـێ      سەدای تۆپ و تفەنگ دەبـێ
شەڕی سەرباز بە شەنگ دەبێ      ئـێران دیلی فـەرەنگ دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (١١)

---

لێرەدا دیاردی ئەکاتە بێ تەل و تلفۆن و تەلگراف کە خەڵک بە هۆی ئەمانە لە ڕێگەی دوورەوە قسەی خۆیان بە یەکتر ئەگەیێنن. لە دەوری کۆن لە ئێراندا بە هۆی ئاورکردنەوە لە سەر لووتکەی کێوەکانا هەواڵیان بە یەکتر ئەگەیاند، یوونانی‌یەکان و ڕۆمی‌یەکانیش هەر ئەم ڕەوشتەیان بوو، وە ئەفریقایی‌یەکانیش بە هۆی تەپڵی (تام‌تام)ەوە هەواڵیان بە یەکتر ئەدا و لە هەندێ شوێنیش‌دا بە هۆی کۆتری نامەبەرەوە هەواڵیان بۆ یەکتر ئەنارد تا کەودشاپ لە ساڵی ١٧٩٤ی زایین تەلگرافی هەوایی داهێنا و پاشان کۆک و ئەوسا ویتستن لە ساڵی ١٧٩٤دا بە هۆی ئەلکتریسیتەی ئاسن ڕفێنەوە پـەیامی لە شـوێنێکەوە ئـەگـەیاندە شـوێنێکی‌تر، بـەڵام وێنەگرێ بە ناوی سامۆیل مۆرس لە ساڵی ١٨٣٢ تەلگرافی بە شێوەیێکی‌تر داهێنا و پاش ئەو لە ساڵی ١٨٥٤ گراهام‌بیل تـەلەفۆنی داهـێنا و لە سـاڵی ١٩٣٠دا مـارکنی دەسـتگای بێ‌تەلی بەدی هێنا. بێ‌تەل و تەلەفۆن و تەلگراف لە ڕۆژگاری قاجاری‌یەکـانەوە هـاتووەتە ئێران و کەڵکی لێ‌وەرگیراوە.

١١ ـ واتە: دڵم گەلێ بە تەنگ ئەبێ، چونکە دەنگی تۆپ و تفەنگ لە هەموو لایێکەوە هەڵئەسێ و ئەوسا سەرباز بە فیشەک شەڕ ئەکا و جیهان ئەکەوێتە ناو ئاژاوە و ئێرانیش دیلی فەرەنگ ئەبێ و ئەکەوێتە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی فـەرەنگی‌یەکـانەوە. دنـیاهەروابـووە و هەرواش ئەبێ.

لێرەدا دیاردی ئەکاتە شەڕی جیهانی یەکەم کە فەرەنگەکان ئێرانیان ژێرپێ کرد، شەڕی جیهانی یەکەم کە لە ١٩١٤ ـ ١٩١٨ی زایین‌دا ڕووی داوە، بلیۆن و نیوێک کەوتوونەتە ناو شەڕ. لەم شەڕە ١٣٤٠ ملیۆن لە هاوپەیمانەکـان چـوونە گـژ ١٦٠ مـلیۆن ئـەڵمانی و

# (١٢)

رەخشی روستەم ئیزهار دەبێ          ئـەسپی ئـاسن رەهـوار دەبـێ
دوڵدڵ شەودێز بەکـار دەبـێ          گەلێ شت هەن ئاشکار دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (١٢)

---

نەمسەوی و مەجەری و تورکی‌دا. لەم شەڕەدا ٦٠ ملیۆن کەس لە ژێر چەکدا بـوون و ٨ ملیۆنیان لە پێناوی چلێسی چەند کەسێکا کوژران و ١٨ ملیۆنیش بریندار کەوتە ناو جیهانەوە. وە دوای شەڕەکەش ١٧ ملیۆن کەس بە برسیەتی و دەربەدەری و نەخۆشی رشانەوە و چاو قوولکە و پەرێشانی‌یەوە مردن. کە واتە ٤٣ ملیۆن کەس لە شەڕی جیهانی یەکەم دا بوون بە گاو و گەردوونی چەند کەسێک. بناغەی ئەم شەڕەش ئەوە بوو کە فرنسیس شای سوربیا لە گەڵ ژنەکەیا لە ناو دروشکەدا بوون و لە لایەن چەند کەسێکەوە رەشەکوژی کران و ئیتر ئەمە بووە هۆی هەڵگیرسانی ئەو شەڕەکە سەری ئەم هەموو حەشاماتەی تیا برد. لەم رۆژگارە لە ئێران‌دا کە ئەحمەد شای قاجار پادشایەتی ئەکرد، هەر شوێنێکی وڵات لە ژێر دەسەڵاتی بێگانەدا بوو، وە فەرەنگی‌یەکان بە جارێ ئێرانیان ژێرپێ کردبوو.

١٢ ـ ئەسپی ئاسن ئەکەوێتە رێ و وەکوو رەخشی روستەم و دوڵدڵ و شەودێز توند ئەڕوا و گەلێ شتی نهێنی ئاشکرا ئەبێ. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هـەر بـەم چەشنە ئەبێ.

لێرەدا دیاردی کردووەتە بەدی هاتنی ترومبێل و خۆڕۆ و قەتار و پیشەسازی و ئامراز و شت و مەکی موتوری. ترومبێل بۆ یەکەمین جار لە لایەنی کوگنوت Cugnotەوە داهات و لە ساڵی ١٧٦٨ی زاین دا تاقی کرا و کەڵکی لێ وەرگیرا، ئەم ترۆمبیلە کە بـە هـەڵمی ئـاو کاری ئەکرد. کاتژمێرێ چوار کیلومتر رێی ئەبڕێ. لە سـاڵی ١٧٨٥دا دەملێر Daimler کالیسکەیێکی نەوتی درووست کرد و پاشان کاربراتۆرێکی بـۆ داهـێنا، لە سـاڵی ١٨٩٦دا کارڵ بنز Carl Benz بۆ یەکەمین جار ترومبێلێکی بە چەشنی ئێستا لە پاریس‌دا داهێناو

# (١٣)

تیغی مەولام بڕان دەبێ        سپای قەجەر قڕان دەبێ
سەر لە مەیدان فڕان دەبێ        ناری دۆزەخ گڕان دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (١٣)

---

خستیە کار. فرنان فۆرست Feanar Forestیش لە ساڵی ١٨٥١ لە کولرمەن‌دا چەند موتوری ٢و٤و٦ سیلەندەری بۆ ترومبێل داهێنا و پاشان لە جیهان‌دا کەڵکی لێ وەرگیرا، رودلف دیزل Rudolf Dieselی ئەڵمانیش کە لە ساڵی ١٨٥٨ لە پاریس‌دا لە دایک بووە، موتۆرێکی داهێنا کە بە هۆی باتری‌یەوە رۆشن ئەبوو، و ئەکەوتە رێ بە چەشنێ کە ئێستا هەیە. پاشان ترومبێل کەوتە وڵاتەکانی‌تریش و کەڵکیان لێ وەرگرت. ترۆمبیل بۆ یەکەمین جار لە ئێران داکە لە زەمانی (مزەفەرەالدین‌شا (١٨٩٥ - ١٩٠٦ی زاین) دا بە هۆی شای ناو براوەوە هێنراوەتە ئێران و کەڵکی لێ وەرگیراوە. ئەم ترومبێلەش بە هەڵمی ئاو کاری کردووە.

١٣ ـ شمشێری سەروەر و خۆشەویستم بە بڕشتەوە قڕ ئەخاتە ناو سپای قەجەرەوە سەر لە مەیدانی شەڕا ئەکەوێتە فڕکە و ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو دەستە بڵێسە و گڕ ئەسەنێ. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

لێرەدا دیاردی ئەکاتە لە ناوچوونی بنەماڵەی قاجار کە لە ساڵی ١٣٤٤ی کۆچی‌دا بە جارێ لە ناو چوو. لەم رۆژگارەدا خەڵکی ئێران ژیانیان بە چەرمەسەرێ و برسیەتی و نەخۆشی و هەژاری‌یەوە ئەبردە سەر و لە هەموو شوێن و قوژبنێکی ئێران‌دا ئاگری شەڕی ناوخۆیی هەڵگیرسا بوو بە جارێ هەمووی خەڵکی ئێران لە بەرامبەری کاربەدەستانی دەوڵەتا راپەڕیبوون و هیوای شنەباینێکی رزگاری بۆ گەلی ئێران هاتبووە دی کەچی هەورێ رەش و تەم و مژی دەوڵەتی دیکتاتۆری رەزاخانی خوێنمژ ئەو هیوایەی لە ناو برد و لە زۆربەی شارەکانا دەرگای بەندیخانەکان کرانەوە و خەڵک ئەوندەی‌تر کەوتنە ناو پەژارە و خەفەتەوە.

## (١۴)

دەورە دەورەی رەزا دەبێ        لە دوای رەزا غەزا دەبێ
لە دوای غەزا فەزا دەبێ        مەردوم دەست بە نزا دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (١٤)

---

١۴ ـ واتە دەور و رۆژگار ئەکەوێتە دەستی (رەضاشا)و لە دوای ئەو شەڕ دەست پێ ئەکا و پاشان جیهان هێمن ئەبێتەوە و خەڵک ئەکەونە نزاکردن و لە خوای مەزن ئەپاڕنەوە. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

لێرەدا دیاردی ئەکاتە کوودتای رەزاخانی خوێنمژ کە بنەڕەتی دەوڵەتەکەی لە سەر ستەم و زەبر و زەنگ و کوشت و کوشتاری خەڵکی بێ گوناهی ئێران دامەزران وە لە سەردەمی ئەم پاتشا ستەمکارەدا خەڵک بۆ زیندوو کردنەوەی ئازادی لە سەرتاسەری ئێراندا راپەڕین و ئەویش هەموو بزووتنەوەیێکی رزگاری خوازی سەرکوت کرد. وە کوشتن و بڕین و تالآن کردنی ماڵی خەڵکی لە لا وەکوو ئاو خواردنەوە بوو. لە خولی رەزاخانی ناپاکا نەتەوەی کورد ژیانیان لە باری ئابووری و کۆمەلآیەتی و رامیاریدا بە تاڵی و نالەباری ئەبردە سەر، وە کوردستان بوو بووە گۆڕستانێکی کش و مات و گەلێ لە ئازادی خوازەکان بە دەستی کاربەدەستانی ئەم پاتشا ستەمکارەوە لە دار دران. بەلآم رەزاخان و هاوکارە دڕندەکانی هەرگیز نەیانتوانی کڵپەی بزووتنەوە لە دڵی نەتەوەی کورد بکوژێننەوە، ئەوە بوو کە لە بزووتنەوە و شۆڕشی سەرتاسەری ئێراندا گەلی کورد شان بە شانی برا ئێرانییەکانی تر خەباتیان کرد تا ئەم شۆڕشە هاتە دی و ئیتر دوای ئەوە فەرهەنگ و زمانی کوردی ئازاد کرا و گەلێ نووسراوی کوردی چاپ و بلآو بووەوە.

## (١٥)

ئێران وەکوو فەرەنگ دەبێ   پڕ نەقش و ڕەنگاوڕەنگ دەبێ
کوڕ وەکوو کچ قەشەنگ دەبێ   مایل بە شۆخ و شەنگ دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (١٥)

## (١٦)

تەیرێ وەک ڕەعد و بەرق دەبێ   گوێچکەی لە دووکەڵ غەرق دەبێ
دەشت و دەری پێ لەق دەبێ   بە ڕووی هەوا مۆلەق دەبێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ (١٦)

---

١٥ ـ ئێران وەکوو فەرەنگستانی لێ دێ و هەموو جێ و شوێنێکی ڕەنگاوڕەنگ ئەبێ و کوڕ وەکوو کچ حەز لە شۆخ و شەنگی ئەکا و خۆی ئەرازێنێتەوە. ڕەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

١٦ ـ واتە: پەلەوەرێ وەکوو گرمەی هەور ئەگرمێنێ و لە گوێیەوە دووکەڵ هەڵئەسێ و خەڵک دەشت و کێوی پێ ئەبڕن و ئەو پەلەوەرە تەنانەت بە ڕووی هەوادا ڕائەوەستێ. ڕەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

لێرەدا دیاردی ئەکاتە بەدی هاتنی فرۆکە و مووشەک و ئەم جۆرە شتانە. کەڵکەڵەی فرین بە ئاسمانەکان هەر لە مێژووە لە مێشک و دڵی مرۆدا بووە و ئادەمیزاد ویستوویەتی لە سەر زەوییەوە بفرێتە ئاسمان. لە ئەفسانەکانی یوونانی کۆندا ئەم هیوایە گەلێ ئەبینرێ. لە نووسراوێکی چینیدا هاتووە کە یەکێ لە قەڕاڵانی چین ئەژدیهایێکی لە پارچەیێکی تایبەتەوە دروست کرد و ناوی ئەو ئەژدیهایەی پڕ کرد لە دووکەڵی گەرم و لە بەرانبەری خەڵکا چووە

# (١٧)

خاسان وە بێ مەڵوەن دەبێ          کام دی بە کامی ژەن دەبێ
زەوق و زینەت و سیار دەبێ          خـەڵقی ژنـان وشیار دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ [١٧]

---

ئاسمان. لە یەکێ لە ئەفسانەکانی کوردیش‌دا هاتووە کە یەکێ لە سەردارانی کۆنی کورد سواری چەرخ و فەڵەک بووە و ئاسمانی پێ بڕیوە. لئوناردوداینچی کە یەکێ لە پەیکەرتەراشان و بژیشکانی ئیتالیایی‌یە لە یەکێ لە پەڕاوەکانی خۆی‌دا ئەڵێ: مرۆ سەرئەنجام بە هۆی باڵی کەرکاشەوە ئەتوانێ وەکوو پەلەوەران بفڕێتە ئاسمان، وە هەر ئەم زانایە لە ساڵی ١٥٠٠ی زایین‌دا دەستگایێکی دروست کرد کە ماوەیێک فڕی‌یە ئاسمان و پاشان لە شوێنێک دا نیشتەوە. لە ساڵی ١٦٧٨دا فەرەنسەوی‌یەکان دەستگایێکیان داهێنا کە باڵەکانی بە هۆی مرۆوە ئەجووڵایەوە. لە ساڵی ١٩٠٣ی زایین‌دا برایانی رایت لە ئەمریکادا فرۆکەیێکیان داهێنا کە بەهۆی موتۆری نەوتی‌یەوە لە هەوادا کەوتە فڕین و بۆ یەکەمین جار مرۆ توانی بە هۆی فڕۆکەوە لە شوێنێکەوە بڕواتە شوێنێکی‌تر و پاشان چەشنەکانی فڕۆکە لە لایەن زانایانی جیهانەوە داهێنرا.

١٧ ـ واتە: پیاوچاکان بە بێ مەڵبەند ئەبن و لە زێد و نیشتمانی خۆیان ئاوارە و دەربەدەر ئەکرێن و ژنان بە کامی خۆیان ژیان ئەبەنە سەر و بە هەزار جۆر خۆیان ئەڕازێننەوە و هەندێکیشیان بە وشیاری‌یەوە ئەژین. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

## (١٨)

مانگ روویـانی دەوڵـەتی      بـادە خـۆرانـی خـەڵوەتی
کـۆتا لبـاس و سـەرپەتی      جامە سپی و خەت خـەتی
هەروا بووە و هەروا دەبێ (١٨)

## (١٩)

"عێل‌بەگی" دی دڵگیر دەبێ      فـەرەنگستان زنـجیر دەبـێ
ئـێران و رۆم نـەخچیر دەبـێ      ئـەوسا فـەزا تـەسخیر دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (١٩)

---

١٨ ـ واتە: مانگ رووان و شۆخ و شـەنگان لە گـۆشە و کـەناری وڵاتدا بـە ئـاشکرایـی ئەگەڕێن و بادەخۆران و مەی نۆشان لە شوێنی تەریکدا خەریکی خواردنەوەی مەی و بادە ئەبن، وە کچان و ژنان بە جل و بەرگی ئاڵ و والا و کورت و سەری پەتی و کوڕان بە کراسی سپی و خەت خەتی‌یەوە ئەگەڕێن و ژیان ئەبەنە سەر. رەوشتی جیهان بەم چـەشنە بـووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

١٩ ـ واتە: "عێل‌بەگی" ئیدی گەلێ دڵگیر و خەمگین ئەبێ، چونکە فەرەنگستان وەکـوو زنجیر ئەلکێ بە یەکەوە و ئێران و رۆم بە دەستی ئەوان نێچیر ئەبێ و ئەوسا فەزا بە دەستی مرۆوە ئەگیرێ. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

مرۆ هەر لە مێژەوە کەڵکەڵەی پەروازی ئاسمانەکان و گرتنی ئەستێرەکـان و فـەزای لە سەردا بووە و بە هیوای ئەو رۆژە بووە کە بتوانێ لە ئەستێرەکاندا دابەزێ و لە ناویانا بگەڕێ و ئاگایی‌یان لێ بە دەست بێنێ. هەروەها ئەزانین رووسەکان لە ٢١ی ئاوریلی ساڵی ١٩٦١

# (٢٠)

هــەمووی شـاهان بیّرا دەبیّ  لە پــڕ شــەڕ و هــەرا دەبــیّ
کەم خەڵق وە حوکمی شا دەبیّ  چــەرخ و چــرا بــەرپا دەبــیّ
هەروا بووە و هەروا دەبیّ (٢٠)

---

گاگارینیان بۆ گەڕان بە دەوری گویّ زەوی‌دا نارد و ڕیّی گرتنی فەزایان بۆ مرۆ کردەوە. لە پیّنجەمی مانگی مەی ئەو ساڵەدا، ئەمریکا (ئلن شپرد)ی نارده فەزا و پاشان نۆرە گەیشتە مانگ و لە ساڵی ١٩٦٩زایین دا توانیان بە هۆی ئاپۆلۆی یانزه و دوانزەوە لە گۆی مانگ‌دا دابەزن و گەلیّ ئاگایی لە بارەی مانگەوە بە دەست بیّنن. پاشان زانایانی جیهان کەوتنە بیری ئەوەی کە لە ئەستیّرە گەڕۆکەکانیشەوە ئاگایی بهیّننە دەست. ئەوە بوو کە لەم دوایی‌یەدا بە هۆی مووشکەکانی خۆیان توانیان گەلیّ ئاگایی لە ئەستیّرەی برجیس و بارام و کەیوانەوە بە دەست بیّنن، وە لە ساڵی ١٩٧٥ ئاپۆلۆی ئەمریکا و سایۆزی رووس لە فەزادا گەیشتنە یەک. بەم چەشنە مرۆ توانی پیّی لە مانگ و ئەستیّرەکان و فەزاش‌دا بکریّتەوە و بە ئاواتی دیّرینی خۆی بگا.

٢٠ ـ واتە: هەموو شایان و پاتشایان گومڕیّ ئەبن و لە بیّ ڕیّی‌دا ئەژین و لە پڕ شەڕ و هەرا لە هەموو گۆشەیێکی جیهانا دەست پیّ ئەکا و کەمتر کەسیّ گویّ ئەداتە فەرمانی شـا، پـاشان جیهان ئارام و هیّمن ئەبیّتەوە و چەرخ و چرا بەرپا ئەبیّ. ڕەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئیّمەش هەر بەم چەشنە ئەبیّ.

"عێل‌بەگی" لەم هۆنراوەدا ئایەی ٣٢ی سوورەی (نمل)مان ئەخاتە بیر کە ئەفەرمیّ: «..ان المُلوکَ اذا دَخلوا قَریَة أفسدوها و جعلوا أعزَّةَ أهلَها أذله...» واتە: پاتشایان کاتیّ ئەڕۆنە شاریّ. خراپە و تووڵانەوە لەو شارەدا بلاّو ئەکەنەوە و خۆشەویستەکانی ئەو شارەش کەنەفت و پەریّشان ئەکەن.

"عێل‌بەگی" لە هۆنراوەکەی‌دا هەروەها دیاردی ئەکاتە شەڕی جیهانی دووهەم کە

## (٢١)

گاگا قەحتی قـەهھار دەبـێ        خەڵقی زەمان هوشیار دەبـێ
نـاهەمواری هـەموار دەبـێ        ئەوسا سەرێ ئـاشکار دەبـێ
هەروا بووەو هەروا دەبێ (٢١)

## (٢٢)

تاعەت بە مەجبووری دەبێ        دی بـازاڕی بلووری دەبـێ
چـینی و فـەغفووری دەبـێ        گوڵبانگیٚ جەمهووری دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٢٢)

---

بێگانەکان دیسانەوە ئێرانیان ژێرپێ کرد. لەم شەڕەداگەلێ زیان گەیشتە نەتەوەکانی جیهان، بە جۆرێ کە ٣٥ ملیۆن کەس کوژراو ٢٠ ملیۆن کەس لە دەست و پێ بێوەری بـوون و ١٧ ملیۆن لیتر خوێنی مرۆ رژایە زەوی و ١٢ ملیۆن ژن منالّی لە بار چوو ١٣ هەزار فێرگە و ٦ هەزار زانستگە و هەشت هەزار لابراتوار وێران و خاپوور بوون و ٣٩٠ هەزار ملیار گوللە لە هەوادا تەقێنرا.

٢١ ـ واتە: ماوەیێ قاتی و قڕی و گرانی دەست پێ ئەکا و پاشان خەڵک وشیار ئـەبنەوە و هەموو ناهەمواری و نالەبارییێ هەموار ئەبێ و ئەوسا سەرێ ئاشکرا ئەبێ و سەر هـەڵئەدا. ڕەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

٢٢ ـ پەرستنی خودا بە زۆر ئەنجام ئەدرێ و ئەو دەمە بازاڕ پڕ لە دەفری بلوور چینی ئەبێ و ئەوسا دەنگی کۆماری لە هەموو شوێنێکدا بەرز ئەبێتەوە. ڕەوشتی جیهان بەم چەشنە بووەو دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

# (٢٣)

کـاری مـەردان نـامەردی بـۆ      دەورانەکەی ڕەنگ زەردی بۆ
دەواکـەیشی دڵـدەردی بـۆ      ڕۆژگـــاری دڵســـەردی بـۆ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٢٣)

---

وشەی کۆمار یا جەمهووری کە لە هۆنراوەکەی عێل‌بەگی‌دا هاتووە، هەر لە مێژەوە لە ناو گەلەکانا باو بووە. ئەفلاتوون پەڕاوێکی بە ناوی (کۆمار) نووسیوە و لەم پەڕاوەدا ئەڵێ: ئەو کەسانەی کە لە باری خوو ڕەوشت و بیری بەرزەوە بەرتری‌یان هەیە، ئەبێ لە لایەنی خەڵکەوە هەلبژێرێن تا ڕێبەرایەتی خەڵک بگرنە ئەستۆ و وڵات بە ویستی خەڵک ببەنە ڕێوە. لە کۆماری‌یەکانی ڕۆم‌دا دەوڵەت بە دەستی هەڵبژێراوەکانی چینی دەرەبەگەوە بوو، وە لە کۆماری‌یەکانی یوونان‌دا چینێکی تایبەت مافی ئەوەیان بوو کە کاربەدەستانی دەوڵەت هەلبژێرن، بەڵام لە کۆماری‌یەکانی ئێستادا خەڵک ئەبێ خۆیان سەرکۆمار هەڵبژێرن و ئەویش بە هۆی هێز و ویستی خەڵکەوە وڵات بباتە ڕێوە. تورکەکانی عوسمانی وشەی کۆماریان لە ئاخر و ئۆخری سەدەی هەژدەمی زایین‌دا لە وشەی جمهوری عەرەبی بە واتای هەمووی خەڵک داهێنا و بە کاریان برد.

٢٣ ـ واتە: پیاوان بە ناپیاوی ڕەفتار ئەکەن و خەڵک، ڕۆژگار بە ڕەنگ زەردی‌یەوە ئەبەنە سەر، وە دەواکەیشی جگە لە خەفەت و پەژارە شتێ‌تر نیە و ڕۆژگارێکی سەر سووڕمانە و زۆربەی خەڵک لە ناو خەم و پەژارەدا ژیان ئەبەنە سەر. ڕەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

## (٢٤)

بانگی یـاری زولاڵ دەبـێ        دەنگی ئەزان بەلال دەبـێ
ناجی بە عیلم و حاڵ دەبێ        ئەوسا زاڵـم بـێحاڵ دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٢٤)

## (٢٥)

ئاوازی سازی حەوت سـەری        نـــاڵەی کـۆسی حـەیدەری
لالە روخــــانی ئــــەنوەری        دانــەی دوری بـێ مـوشتەری
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٢٥)

---

٢٤ ـ بانگی یاری روون ئەبێتەوە و دەنگی بانگی بلال ئەگاتە گوێی خەڵک و پاشان رزگار کەرێ لە لایەنی خواوە پەیدا ئەبێ و خەڵک بەرە و رێی راست رێنموونی ئەکا و ئـەوسا ستەمکار، زۆر پەشێو و خەمگین ئەبێ. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

٢٥ ـ ئاواز و سازی حەوت سەری و ناڵەی کۆسی حەیدەری لە هەموو شوێنێکدا دەنگ ئەداتەوە و گوڵاڵە رووەمەتان لە دەوری ئەوانا کۆ ئەبنەوە، بەڵام بە داخەوە دوردانەکان بـێ کڕیار ئەمێنێ و کەس قەدری نازانێ. "عێلبەگی" ئەم هۆنراوەیە بە گۆشە و پلار هێناوە.

## (٢٦)

نەوەرد لە ڕووی دەوران دەبێ نـاڵەی شـێر و بـەوران دەبـێ
مـەولام لە سـەر ئـێران دەبێ قـەڵای دوژمـن وێـران دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٢٦)

## (٢٧)

شەربەتی خوا وەک هەنگ دەبێ هەرکەس بیخوا خوشڕەنگ‌دەبێ
دوژمـن گـەلێ بێ ڕەنگ دەبێ ژیـنی تـاریک و تـەنگ دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٢٧)

---

٢٦ ـ واتە: لە ڕووی جیهان‌دا شەڕ و هەرا دەست پێ ئەکا و شێردڵان و نەبەزان لەو هەرا و شەڕەدا ناڵەیان بەرز ئەبێتەوە و خوام ئێران ئەپارێزێ و قەڵای دوژمن و نەیار وێران و خاپوور ئەکا. ڕەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

٢٧ ـ شەربەتی خوا وەکوو هەنگوێن شیرینە و هەرکەسێ دڵۆپێکی لێ‌بخواتەوە خوشڕەنگ و دڵخۆش ئەبێ. بەڵام دوژمن گەلێ بێ‌ڕەنگ و لاواز و خەمبار ئەبێ و ژینی لە تاریکی و تەنگ و چەڵەمەدا ئەباتە سەر. ڕەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هـەر بـەم چەشنە ئەبێ.

## (٢٨)

دوو سپای گەورە بە جەنگ دەبێ نـاڵەی تـۆپ و تـفەنگ دەبـێ
دنـیا تـاریک و تـەنگ دەبـێ شەڕی سەرباز بـە شـەنگ دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٢٨)

## (٢٩)

دیوانی گورگ و مـەڕ دەبـێ دەشتی بەغدا بە شـەڕ دەبـێ
گشتی بـۆ زێـو و زەڕ دەبـێ خەڵقی ساجان بێ فەڕ دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٢٩)

---

٢٨ ـ واتە: دوو سپای گەورە بە شەڕ دێن و ناڵەی تۆپ و تفەنگ بەرز ئەبێتەوە و جیهان بە جارێ تاریک و تەنگ ئەبێ. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بـووە و دوای ئـێمەش هـەر بـەم چەشنە ئەبێ. لێرەش‌دا دیاردی کردووەتە شەڕێکی گەورە کە لەمەولا ئەقەومێ.

٢٩ ـ واتە: دیوانی گورگ و مەڕ پێک دێ و دەشتی بەغدا ئەبێتە مەیدانی شەڕ و ئەم شەڕەش بۆ بەدەست هێنانی زێو و زێڕ دێتە دی و تەیلەسان بە کۆڵان گەلێ بێ فەڕ و فەرهەنگ ئەبن و ئاوەزی خۆیان لە دەست ئەدەن. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بـەم چەشنە ئەبێ.

لێرەش دا ئەم هۆنراوەیە بە گۆشە و پلار هێناوە و دیاردی کردووەتە شەڕی ئەمریکا و عێراق کە ئەمریکا بۆ بە دەست هێنانی نەوت شەڕی کردوو هەزاران کەسی کوشت.

## (٣٠)

دیوان کەریۆو و تازی دەبێ        سەر لە مەیدان بـازی دەبـێ
پـەنجە گـەزان قـازی دەبـێ        ئـەوسا مـەولام رازی دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٣٠)

## (٣١)

عەلی لە غەیب پـەیدا دەبـێ        دوڵدڵ بۆ شەڕ شەیدا دەبـێ
مونکر خـار و ریسـوا دەبـێ        دیســان جـیهان ئـاوا دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٣١)

٣٠ ـ واتە: دیوانی تانجی و کەروێشک پێک دێ و لە مەیدانی شەڕدا بە سەر یاری و گەمە ئەکەن و قازی پەنجەی خۆی لە داخا ئەگەزێنێ و ئەوسا خوا رازی ئەبێ. رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووەو دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ. لێرەش دا ئەم هۆنراوەیە بە گۆشە و پلار هێناوە.

٣١ ـ واتە: عەلی لە پێوارەوە سەر هەڵئەدا و دوڵدڵ بۆ شەڕ شەیدا ئەبێ و لەم سەردەمەدا ناخوا و بێ بڕوا پەست و ریسوا ئەبێ و جیهان دیسان ئاوا ئەبێتەوە رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ. ئەم هۆنراوەیشی بە گۆشە و پلار هێناوە.

# (٣٢)

ئەو وەخت جەنگی جیهات دەبێ نوختەی یاران هاتهات دەبێ
دیدەی مونکر زوڵمات دەبێ سەیری مەولام نشات دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٣٢)

# (٣٣)

هەفتا و دوو دین یەک‌دین دەبێ سەر دەفتەری ئەمین دەبێ
تاڵم لە زاری و شین دەبێ دڵی گەلێ بە کین دەبێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٣٣)

---

٣٢ ـ واتە: ئەوسا شەڕی خەزا دەست پێ ئەکا و گەلێ لە یاران لە ڕێی خوادا ئەکوژرێن و بێ بڕوایان هەر لە بێبڕوایی و نەزانی دا ئەمێننەوە و سەرئەنجام خواپەرستان بە سەر بێ بڕوایان‌دا سەر ئەخا و پیرۆزیان ئەکا. ڕەوشتی جیهان بەم چەشنە بووە و دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ. ئەم هۆنراوەیەش گۆشە و پلارە بۆ ڕووداوەکانی داهاتوو.

وشەی (نوختە) کە لەم هۆنراوەدا هاتووە بریتی‌یە لە: مرۆی پاک و خاوێن. هافی عەلی خۆی بە نوختە دائەنێ و ئەڵێ: أنا نُقطةُ تَحتِ باء بِسمِ‌الله واتە من نوختەی ژێر بێی "بسم‌الله"م "شبلی"ش کە یەکێ لە خواناسانی گەورەی ئیسلامی‌یە ئەڵێ: اَنا النُقطه التی تَحتَ الباء" واتە: من ئەو نوختەیەم کە لە ژێر بێ‌دایە.

٣٣ ـ واتە: سەرئەنجام هەفتا و دوو دین دەبێتە یەک دین و سەردەفتەر و ڕێبەری ئەم ڕێ و ڕچە پیاوێکی دڵپاک و دروستکار ئەبێ و ئەوسا ستەمکار ئەکەوێتە زاری و شین و دڵی لە حەنای ئەوا بە کین دەبێ. ڕەوشتی جیهان بەم‌چەشنە بووەو دوای ئێمەش هەر بەم‌چەشنە ئەبێ.

## (٣٤)

"عێلبەگی" دی دڵشاد دەبێ      لە دەرد و غـەم ئـازاد دەبـێ
یـارانـی گشت لە یـاد دەبێ      دوژمن لە زاری و داد دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٣٤)

## (٣٥)

سستی مێزەر خـڕان دەبـێ      سەر لە مەیدان فڕان دەبـێ
هەمێستار گشت قڕان دەبێ      ئاوری دۆزەخ گڕان دەبـێ
هەروا بووە و هەروا دەبێ (٣٥)

---

٣٤ ـ واتە: "عێلبەگی" ئیدی دڵخۆش و شادمان ئەبێ و لە دەرد و خەم و پەژارە رزگاری ئەبێ و ئەوسا هەمووی یاران دێنێتە یاد و دوژمنیش ئەکەوێتە زاری و شین و هاوار کردن.

٣٥ ـ واتە: مێزەرەکان سست و خڕ ئەبێ، سەرەکان لە مەیدانی شەڕا ئەفڕێ، خەنیم و دوژمن قڕیان تێ ئەکەوێ، ئاوری دۆزەخ بە جارێ گڕ ئەگرێ، رەوشتی جیهان بەم چەشنە بووەو دوای ئێمەش هەر بەم چەشنە ئەبێ.

پێش بینییەکانی عێلبەگی لە رۆژگاری نادرەوە تا ئەم بەروارە لە بەر ئەوە بۆ ئێمە روون بوو لە بارەیەوە دواین، وە لەگەڵ رووداوەکاندا بەرانبەرمان کردن، بەڵام لەم بەروارە بەدواوە چۆنیەتی ئەو پێشبینانە بۆ ئێمە روون نین، و بەم هۆیەوە نەمانتوانی جگە لە هێنانی وتەکانی خۆی لێیان بکۆڵینەوە. بێگومان چینە دواییەکان یەک لە شوێن یەک لەو پێشبینیانە ئاگەدار ئەبن و لەگەڵ چۆنیەتی دەوراندا بەرانبەریان ئەکەن.

## یادداشته‌کان

**١ ـ شاره‌زوول:** یا شاره‌زوور به پێی وته‌ی (یاقووت) ناوچه‌یێکی گه‌وره‌یه‌ که‌ که‌وتووه‌ته‌ نێوانی هه‌ولێر و هه‌مه‌دان. له‌ (دائرةالمعارف الاسلامی) دا هاتووه‌ که‌ بنه‌ماڵه‌ی حه‌سه‌نه‌وی‌یه‌ که‌ له‌ ساڵه‌کانی ٤٠٠ تا ٤٣٢ی کۆچی له‌ شاره‌زووردا فه‌رمانڕه‌وایی‌یان ئه‌کرد. له‌ ساڵی ٦١٣دا بوومه‌له‌رزه‌ شاره‌زووری به‌ جارێ وێران کرد. (ابن‌مهلهل) ئه‌ڵێ: شاره‌زوور داگری چه‌ند شار و دێیه‌ و یه‌کێ له‌ شاره‌کانی شاره‌زوور ناوی (شیز)ه‌ که‌ ئێستا له‌ ئازه‌ربایجان له‌ سێ کیلومتری تیکانته‌په‌ی هه‌وشار دایه‌. زانایانی کوردی ئه‌م دوایی‌یه‌ سنووری شاره‌زووریان له‌ باشووره‌وه‌ زنجیره‌کێوی به‌مۆ و له‌ باکووره‌وه‌ زنجیره‌کێوه‌کانی شارباژێر و له‌ خۆر هه‌ڵاته‌وه‌ کێوی شاهۆ و له‌ خۆر ئاواوه‌ زنجیره‌کێوه‌کانی قه‌ره‌داغ داناوه‌. به‌ پێی به‌ڵگه‌کانی مێژوویی ئه‌م شاره‌ (زوور) کوڕی ئه‌ژده‌هاکی مادی ئاوای کردووه‌ته‌وه‌.

**٢ ـ یارسان:** به‌ حه‌قه‌کان یاکاکه‌ی‌یه‌کان ئه‌ڵێن که‌ رێ و رچه‌یێکی تایبه‌تیان هه‌یه‌ و له‌ ئایینه‌ کۆنه‌کانی ئێران سه‌رچاوه‌ی گرتووه‌. به‌ڵام پاش بڵاو بوونه‌وه‌ی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ره‌نگ و بۆی ئیسلامی گرتووه‌ته‌ خۆی له‌ راسته‌قینه‌ش‌دا، رێ و رچه‌ی خواناسی که‌ بریتی‌یه‌ له‌ په‌یوه‌ندگرتن له‌گه‌ڵ هێزی به‌دی هێنه‌ری ئه‌م جیهانه‌دا له‌ هه‌موو ئایینێکا یه‌کێکه‌. ئه‌م یارسانانه‌ هه‌موو نووسراوێکیان به‌ زمانی کوردی‌یه‌ و زۆربه‌ی په‌ڕاوه‌کانیان که‌ له‌ سه‌ده‌ی دووهه‌می کۆچی تا سه‌ده‌ی سێزه‌هه‌می کۆچی‌دا نووسراوه‌ به‌ هۆنراوی ده‌ هیجایی گۆرانی هۆنراوه‌ته‌وه‌ که‌ هه‌ندێ له‌و په‌ڕاوانه‌ بریتین له‌: سه‌رئه‌نجام، ورده‌ سه‌رئه‌نجام، ده‌وره‌ی هه‌فته‌وانه‌، ده‌وره‌ی چلته‌ن، ده‌وره‌ی عابدین، ده‌وره‌ی بالوول، ده‌وره‌ی بابه‌ سه‌رهه‌نگ، ده‌وره‌ی شا خوه‌شین، ده‌وره‌ی بابه‌ ناووس، ده‌وره‌ی دامیار، ده‌وره‌ی بابا جه‌لیل، ده‌وره‌ی حه‌یده‌ری، بارگه‌ بارگه‌

بارگە، گلێم وە کۆڵ، دەفتەری پردیوەر، دەفتەری ساوا، دەفتەری دیـوان گـەورە، زولاڵ زولاڵ، کەلامی عێلبەگی جاف، کەلامی خان ئـەڵماس، کـەلامی تـیموور، کەلامی نەورۆز، کەلامی شێخ ئەمیر و..."

٣ـ زمانی کوردی کە یەکێکە لە لقەکانی زمانەکانی هند و ئوروپایی بێ گۆمان پاشماوەی زمانی مادی‌یە و لە درێژایی رۆژگاردا گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە، وە بە هۆی گۆڕانـی بـاری کـۆمەلایەتی و رامـیاری و ئـابووری مـەڵبەندەکـان و دراوسێیەتی و تێکەڵ بوون لەگەڵ زمانەکانی ترا، بە چەند زاراوەی ناوچەیی دابەش بووە. وە زمانی کوردی ئێستا داگری پێنج زاراوەی گەورەیە: ١ ـ زاراوەی کرمانجی باکووری کە ئەم مەڵبەندانە ئەگرێتەبەر: ماکۆ، ورمێ، خۆی، سەڵماس، هـەوشار، قووچان، بجنوورد، کەلات، دەرەگەز، شیروان، فاراب، رووبار، دەماوەند لە ئێران. بادینان، دهۆک، ئاکرێ، بارزان لە عێراق. ئێرەوان و بەشێ لە ئەرمەنستانی رووسیە و قارس و دیاربەکر و وان و ئەرز رۆم و بتلیس و ئەخلات و سعرد لە تورکیە و بەشێک لە سووریە و لبنان. ئەم زاراوە بریتی‌یە لە شێوەکانی "بۆتانی، بادینانی، بایەزیدی، شەمدینانی، عەبدۆیی، قووچانی. ٢ ـ زاراوەی کرمانجی باشووری: کە ئەم مەڵبەندانە ئەگرێتە بەر: سنە، مەریوان، جوانرۆ، سەقز، بانە، سـابلاخ، سـەردەشت، بـۆکـان، میاندواو، شنۆ، هەوشار لە ئێران، وە رەواندز، حەریر، هـەولێر، پـژدەر، مـووسڵ، کەرکووک، سلێمانی، پێنجوێن لە عێراق. ئەم زاراوە بریتی‌یە لە شێوەکانی: سۆرانی بابانی، موکریانی، ئەردەلانی. ٣ ـ گۆرانی یا هەورامی: کە ئەم مەڵبەندانە ئەگرێتە بەر: ژاوەرۆ، هەورامانی تەخت، نەوسود، پاوە لە ئێران. تەوێڵێ. بـیارێ، ئـیلان‌پێ لە عێراق، وە هەندێ لە هۆزەکانی گۆران و هەوشار و خانەقین و زەنگەنە و سیامەنسوور لە ئێران و عێراقدا بەم زاراوە ئەدۆن. ئەم زاراوە بریتی‌یە لە شێوەکانی: هەورامانی تەخت، لهۆنی. ژاوەرۆیی، زازایی. ٤ ـ لەکی: کە ئەم مـەڵبەندانـە ئـەگـرێتە بـەر. کرماشان، مایدەشت، کولیایی، دەینەوەر، قەسرشیرین، نەیریز لە ئێران، خـانەقین،

مەندەلی، بەدرە، کووت لە عێراق، ئەم زاراوە بریتی یە لە شێوە کانی: کەڵهوڕی، ئیلامی، کوودەشتی، شیروانی. ٥ - لۆری: کە بریتی یە لە شێوە کانی: فەیلی، بەختیاری، هەفتگلی، سووسەنگردی، ئەم زاراوە لە بنەڕەتا بە دوو شێوە دابەش ئە کرێ، یە کەم شێوەی لوڕی بەختیاری کە مەڵبەندە کانی: دزفوول، شاری کورد، چوارمەحاڵ، پشتکۆ و ناوچە کانی تری بەختیاری ئە گرێتە بەر. دووهەم شێوەی لوڕی فەیلی کە لەم مەڵبەندانەدا وت و وێژی پێ ئە کرێ: خورەماوا "ئەلشتەر و ناوچە کانیان".

**٤ - ئەحمەدی کەرکووکی:** یە کێ لە هۆنەرانی سەدەی شەشەمی کۆچی یە، بە پێی پەڕاوی "سەئەنجام" ئەم هۆنەرە لە سەرەتای سەدەی شەشەم لە شاری کەرکووکدا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر بە منالی گەلێ وریا و زیرەك بووە و لە تافی جوانیدا هۆنراوی باشیشی هەڵبەستووە. زۆربەی هۆنراوە کانی خوانـاسی یە و لە پەڕاوی سەرئەنجامدا تۆمار کراوە. ئەم تا کە هی ئەوە کە ئەلێ:

**ئـەز ئـەحمەدی زێـڕین بـەرم ‏ ‏ ‏ ئەز ئەو دوڕەی ناو گـەوهەرم**

**٥ - عابدینی جاف:** یە کێ لە هۆنەرانی سەدەی هەشتەمی کۆچی یە کە بە پێی پەڕاوی "سەرئەنجام" ئەم هۆنەرە لە ساڵی ٧٢٠ی کۆچی لە شارەزوورا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و هەر لەوێش لە لای مەلا ئەلیاسی شارەزووری کە یەکێ لە زانایان و هۆنەرانی ئەو سەردەمە بووە خوێندویەتی تا بووە بە مەلایێکی شارەزا. لە عابدینەوە پەڕاوێ بە ناوی "دەورەی عابدین" بە جێ ماوە کە هەمووی بە شێوەی هـۆنراوی هەشت هیجایی یە. ئەم هۆنراوانە هی ئەوە کە ئەڵێ:

**ئینسان لە بـۆ جـیفەی دنـیا ‏ ‏ ‏ خۆی وە کوشتن قەزا دەدا**
**سوودی نیە لە ڕۆی عوقبا**

# پێش بینی یەکانی

## ئەڵماس خان

کۆکردنەوە و ئامادە کردنی: د. سدیق بۆرەکەیی



وێنەی خەیاڵی ئەڵماس خان کە بە قەڵەمی هونەرمەند کاک هادی زیائەدینی کێشراوە

کلام خان الماس لرستانی

- اول و آخر یار

چوار گوشه‌ی مَن چوار گوشه‌ی ما تن ۱ صراف مزانو چوار گوشه‌ی ما تن

بگیر بگیرن صلابت صلا تن — آشوب شارن ش خروشین واتن

نطق وزلن ژ روزگاران — کوهان ما رگیرو دشتان سواران

تک او ماران ویم نه و سواران — زار مار فاسن ژ نیزه داران

تک بدیم ودم نیشن ماروه — نه هوس ودم نیزه داروه

ایران مسلمان راهی حق شناسان — سواران کافر خدانشناسن

غلغله‌ی روم خاقان قیصر — چون گله گیرو سرزمین یکسر

زنگی زنگه وار تاتار هوش — گردان اطراف ترکان سرکش

نه ژ ریبال هند طغیان عسکر — غیر و هیاهو نامداران یکسر

نشام تا حلب بسلخ و بخارا — ژ اطراف چین فغفور دارا

گردا گرد جهان فرهنگ عروس — بلند بو ناله صدای طبل کوس

عرشت پامال سم ستوران — هند گیرو فرنگ ایران و توران

چکاچاک تیغ نامی نامداران — برق رعد و کوس غران سواران

چینی کمان بارام سرکشان — تا ژه پیکانان تیر ترکشان

ژ زاره‌ی آه هر شوم ستاران — هنگامه‌ی نبرد توپ قسپاران

وێنەی دەستنووسی چەند هۆنراوەیێکی خان ئەڵماس

## پێشەکی

نامیلکەیێ کە بە ناوی: "**پێش‌بینی‌یەکانی خان ئەڵماس**" ناسراوە، داگری زنجیرەیێ ڕووداوە لە بارەی ئایندەی نەتەوەی ئێرانەوە کە شاخوەشین ئەو ڕووداوانەی لە سەدەی پێنجەمی کۆچی‌دا پێش‌بینی کردووە و خان ئەڵماسیش لە ساڵی ۱۳۱۴ی کۆچی‌دا بە هۆنراو هۆنیەتەوە.

ئەم ڕووداوانە هەر کام لە خول و ڕۆژگارێکی دیاری کراودا ڕووی داوە، پەلاماری تەیمووری‌یەکان (۷۷۲ - ۸۰۷ کۆچی) بە سەر وڵاتی ئێران و دامەزرانی شەڕ و شۆڕ و هەرا لە هەموو شار و شوێنێکی وڵات‌دا، بەشی هەرە گرنگی پەڕاوەکە پێک دێنێ. لەم ڕۆژگارەدا تەتەرەکان ئێران داگیر ئەکەن و هەموو جێ و شوێنێکی ئەسووتێنن و بەزەیی‌یان بە کەسێک‌دا نایێ و هەر کەسیان بەرکەوێ ئەیکوژن.

لە جیهان‌دا کوشت و کوشتار و تووڵانەوە ڕووئەدا و دنیا تاریک و تەنگ ئەبێ و بڵێسەی ئاگری شەڕ بەرز ئەبێتەوە و لەشکر و سپای نەیار هێز ئەسەنێ و بەسەر هێزی خۆیی‌دا زاڵ ئەبێ، بەڵام لە پڕ دەرگای هیوا بۆ گەلی ئێران ئەکرێتەوە و خەڵک بە سەر هێزی دوژمن‌دا زاڵ ئەبن و ئەوسا چەند بنەماڵە بە ناوانی: "**سەفەوی و هەوشاری و قاجاری و پالەوی**" لە ئێران‌دا فەرمانڕەوایی ئەکەن و لە هەموو دەورەکان‌دا بە جارێ گەلی ئێران ئەچەوسێننەوە و هەموو خێر و بێرێکی وڵات لە ناو ئەبەن.

لە ساڵی **۱۳۵۷**دا هەمووی گەلی ئێران یەک ئەگرن و ڕائەپەڕن وگەلێکیان لە ڕێی ڕزگاری و ئازادی‌دا لێ ئەکوژرێ و خوێن وەکوو لافاو هەڵئەسێ و سەرئەنجام خەڵک سەر ئەکەون و شوێنەواری شایانی ئێران بە جارێ لە ناو ئەبەن. گەلێ ڕووداوی تریش ڕوو ئەدا کە لە نامیلکەکەدا هاتووە.

خان ئەڵماس کە کوڕی موحەممەد بەگی لوڕستانی‌یە بە پێی "یادداشتەکانی

کاکاردیی" لە ساڵی ١٠٧٢ی کۆچی لە لوڕستان‌دا پێی ناوەتە مەیدانی ژیانەوە و لە منداڵی‌دا لە لای باوکی خەریکی خوێندن بووە و لە تافی جوانی‌دا خێی داوەتە هۆنراوەی هۆنەرانی کورد و گەلێ هۆنراوی لە بارەی رێ و رەوشتی خواناسی هۆنیوەتەوە کە لە پەڕاوێکدا بە ناوی **(کەلامی خان ئەڵماس)** کۆ کراوەتەوە. لە ساڵی ١١٣٤ی کۆچی‌دا پێش‌بینی‌یەکانی خۆی داناوە و پاشماوەی ژیانی بە هۆنراو هۆنینەوە و رێنموونی خەڵك بردووەتە سەر تا لە ساڵی ١١٣٨ لە تەمەنی ٦٦ ساڵی‌دا کۆچی دوایی کردووە. زولفەقاری گۆران لەم بارەوە ئەڵێ: وە سەنەی هەزار و سەد و سی و هەشت، خان ئەڵماس لوا وە دلێ بەهەشت واتە: لە ساڵی ١١٣٨دا خان ئەڵماس کۆچی کردە ناوی بەهەشت.

پێش‌بینی‌یەکانی خان ئەڵماس لە شەش بەندا هاتووە کە هەر بەندێکی داگری چەند هۆنراوی دە هیجایی‌یە. نوسخەی ئەم پێش‌بینی‌یانە کە کەوتووەتە دەستی ئێمە لە ساڵی ١٣٣٨ی کۆچی‌دا نووسراوە و "ئەدیبولمەمالکی فەراهانی" گەلێ لەم پێش‌بینی‌یانەی بە هۆنراوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی و لە چاپی داوە.

لێرەش‌دا تکا لە خوێنەرە خۆشەویستەکانی کورد ئەکەم کە هەر کەسێ پارچە هەڵبەستێکی پێش‌بینی خان ئەڵماسی لا هەبێ کە لەم نامیلکەدا بڵاو نەکرابێتەوە بۆمانی بنێرێ تا لە چاپی دووهەم‌دا بڵاوی کەینەوە. ئیتر هیوادارم بە هەموو لایێکمانەوە بتوانین بۆ بووژاندنەوە و زیندوو کردنەوەی کەلەپووری نەتەوەکەمان هەنگاو هەڵگرین و لەم رێگەوە راڕە و خزمەتی زمانەکەمان بکەین.

تاران ١٣٥٩ - سدیق بۆرەکەیی

## (١)

چوارگۆشە ماتەن، چوارگۆشە ماتەن
سەراف مەزانۆ چوارگۆشە ماتەن
بگیر بگیرەن سەلاٚتەن
ئاشۆی شارانەن شاخوەشین واتەن
نوتق ئەزەڵەن ژ رۆژگاران
کۆهان مارگێرۆ دەشتان سواران
تەک ئەو ماران ویم نە وە سواران
ژار مار خاسەن ژ نێزە داران
تەک بدەیم وە دەم نێش مارەوە
نە ناموس وە دەم نێزە دارەوە
یاران موسڵمان رای حەق شناسەن
سواران کافر خودا نەشناسەن
غولغولەی رۆمان خاقان قەیسەر
چون کولە گێرۆ سەرزەمین یەکسەر
زەنگی زەنگەوار تاتار هەوەش
کوردان ئەتراف تورکانۆ سەرکەش
نە ژێر باڵ هند توغیان عەسکەر
خێزۆ هەیاهوو نامداران یەکسەر
نە شام تا حەلەب، بەڵخ و بوخارا
ژ ئەتراف چین فەغفوور دارا

گرداگرد جیهان فەرەنگ عورووس
بوڵەند بۆ ناڵەی سەدای تەپڵ کووس
غورشت پاناڵ سم ستووران
هەند گێرۆ فەرەنگ ئێران و تووران
چەکاچاک تێغ نامی نامداران
بەرق رەعد کۆس غوڕان سواران
چینی کەمەنان بارام سەرکەشان
قاژەی پەیکانان تیر تەرکەشان
شەرارەی ئاهر شوومی ستاران
هەنگامەی نەبەرد تۆپ قومپاران
هەیهات گوردان بەرگ فۆڵاد پووش
تەڵەب کار رەزم هوون سیاووش
گەرد و تۆز و تەم مەرکەبان ژ خاک
گێرۆ کەهکەشان مەرتەبەی ئەفلاک
هەر نە هندوستان تا وە فەرەنگی
ئاراستە مەبۆ چەند تۆپ جەنگی
یەوم مەحشەر بۆ نە چاڵەی قەزوێن
چەند هەزار ئاڵە مەگێڵۆ وە زین
چەند هەزار ئاڵە گشت ئەبڵەق نیشان
مەگێڵۆ وە زین بێ سەر و سامان
هەفت شەو و هەفت‌رۆ جەنگ‌دین مەبۆ
ئاو ئاسیاوان گشت وە خوین مەبۆ

ســوور ئـيسرافـيل نه رووی ئەورەوە
یـــاڵدار و بـــاڵدار نـەچوار دەورەوە
تـەخت زەڕنـيشان شـاهی بـەگـلەران
مـــەیۆ وە یـــوورتگای ســم ســتووران
نـــە ســـوڵتانیه قـــڕ بـــۆ ســوڵتانان
نـە زەنگـان گـیرۆ عـەزیم دیـوانـان
کاسەی کەلەی سەر قەیسەر وەجام بۆ
پـیاڵەی فـەغفوور مـەجلس سـام بـۆ
تـورکان ژ سـەرین کـوردان ژ دامـان
ژ پـای (سـەهەندکۆ) سـان غـولاٌمان
وەی هــەنگام تـەنگ ئـەوەن بـەلاٌ شۆ
قـــەوم بـابا خـوەشین ئـازادە بـەرشۆ
ئـــازادە بـــەرشۆ بـــەرشۆ وە کـەنار
گــەنج پـەی یـارسان بـەیۆ وە خـەروار
وە هەر هەفت ئقلیم حـوکمش ئـیزهاربۆ
بـلال جـاڕ کـێشۆ دەور دەور یـار بـۆ
شـــەرارەی ئـاتەش بـەرق ذولفـەقار
زوهــرە دوور مـەبۆ سـاتێ سـەد هـەزار
مـەشرق تـا مـەغرب بـەندەر تـا بـەندەر
گشت ئامان مەوەن وە سـاقی کـەوسەر
ئـەر هـەی سـەرافـان دانـە شـناسان
بـــینایی عـــەینان رۆشـنایی زەیـنان

شــادی کــەن شــادی عــەجەو تــەماشا
فکــر ئــەو رۆکــەن نــیەن جـای حـاشا
(خــان ئــەڵماس) یــەقین بکــەرە بـاوەر
وادە تــەمامەن جــیهان مــەو یــەکسـەر

*****

**واتە:** چوار گۆشەی جیهان ماتە، گەوهەر ناس ئەزانێ کە چوار گۆشەی جیهان ماتە، بگیر بگیر و هەراو هەنگامەیە، بشێوی شارانە، شاخوەشین وتوویە، ئەمە فەرمانی رۆژی بەرینە کە ئەبێ روو بدا، کێوەکان مار ئەیگرێ دەشتەکان سواران، لەگەڵ ئەو مارانە دابین باشتر لەوەیە کە لەگەڵ سوارەکان دابین، ژاری مار باشتر لە تێزەی نێزە دارانە، پاڵ بدەینە مارەکانەوە و چزەی مارەکان بچێژین باشترە، نە ئەوەی ئابڕوومان بدەینە دەستی نێزەدارەکانەوە، مارەکان مـوسڵمانن و رێـی خـوا ئـەناسن، بـەڵام سوارەکان بێبڕوان و خوا ناناسن، هەرای رۆمی‌یەکان و پیاوانی خاقان و قەیسەر، وەکوو کوولله زەوی‌یەکان داگیر ئەکەن، زەنگی‌یەکان و تەتەرەکانی خوێنخۆر و بێبەزەیی راوەستاون، کوردانی دەور و بەر و تورکەکانی سەرکێش رائەپەڕن، هندی‌یەکان گوستاخ ئەبن و سەربازەکان سەرکێشی ئەکەن، هەراو هەنگامەی پیاوانی ناودار بەرپا ئەبێ، لە شام تا حەلەب، بەڵخ و بوخارا، لە دەوروبەری چین و ئـێران ولاّتی فەغفوور و دارا، تەواوی جیهان فەرەنگ و رووس، ناڵە و دەنگی تـەپڵ و کۆس بەرز ئەبێتەوە، دەنگی پێلاّوی شەڕکەران و سمی چوارپایان، فەرەنگەکان هند و ئێران وـ تو‌ـوران ئەگرن، دەنگی چەکەکانی پیاوانی شەڕکەر، چەخماخەی هەورە تریشقە و دەنگی تەپڵ و کۆس و ناڵەی سوارەکان، کەمەن بە دەستانی چینی وەکوو بارام سەر هەڵئەدەن، قاژەی پەیکانەکان و تیری لەشکرەکـان، پـزیسکەی ئـاور و تررووسکەی ئەستێرەکان ئەبینرێ، هەنگامەی شەڕ و هەرا و دەنگی تۆپەکان، داخ و موخابنی تیپی لەشکری پۆلاّپۆش، شەڕکەرانی خوێنی سیاوەخش، گەرد و تـۆز و

تەمی ئەسپان لە خاك هەڵئەسێ، کاکێشان ئەگرێ تا چەرخەکانی تر، هەر لە هیندوستان تا وڵاتی فەرەنگ، چەند تۆپی شەڕی دائەنرێ، لە چاڵەی قەزوێندا شەڕێک پەیدا ئەبێ، چەند هەزار ئەسپی ئاڵ بەزین لە مەیدانی شەڕ دائەگەڕێ، چەند هەزار ئەسپی کوێت بە زین ئەگەڕێ بە بێ سەر و سامان، حەوت شەو و حەوت ڕۆژ شەڕی دین ئەبێ، ئاوی ئاشەوان لە خوێن پڕ ئەبێ، شاخنەفیری ئیسرافیل بە رووی هەورەوە، باڵدار بە چوار دەوری جیهانا ئەگەڕێ، تەختی زێڕ نیشان شایی بە گەلەران، دێنە لەوەرگەی چوارپێیان، لە سوڵتانیە زۆربەی پادشاکان فڕ ئەبن، لە زەنگاندا دیوانێکی گەورە پێک دێنن، کاسەی کەللەی سەری قەیسەر ئەبێتە پیاڵە، پیاڵەی فەغفوور دەست بە دەست ئەگەڕێ، تورکەکان لە سەرەوە و کوردەکان لە داوێن کۆ ئەبنەوە، لە داوێنی کێوی سەهەنددا خولامەکان گرد ئەبنەوە، لەم کاتەدا گەلێ وەی و ئاپوورە پەیدا ئەبێ، لایەنگرانی بابە خوەشین ئازاد ئەبن، ئەوان ئازاد و سەربەخۆ ئەبن، وە گەنج بۆ کاکەییەکان کۆ ئەبێتەوە، بلال جاڕ ئەکێشێ و دەور دەوری یار ئەبێ، وە پزیسکی ئاور و ترووسکەی شمشێرەکان، ئەستێرەی ناهێد هەر ساتێ ئەترووسکێتەوە، خۆرهەڵات تا خۆرئاوا، بەندەر تا بەندەر، هەموویان لە سەرۆک داوای هانا ئەکەن، بەس ئەی گەوهەرناسەکان و ئەی دوڕناسەکان، بینایی چاوان و ڕۆشنایی هۆشەکان، شادی کەن شادی و سەرنجی جیهان بدەن، وە بە بیری ئەو ڕۆژەدا بن کە لە بیر ناچێتەوە، ئەی «خان ئەڵماس» بە چاوێکی روون سەرنجی جیهان بدە، چونکە کاری جیهان یەکسەر ئەبێ و لە ناو ئەچێ.

*****

## (٢)

یـــــاوەران ئـــاشۆ، یـــاوەران ئـــاشۆ
نـــــوتق ئـــەزەڵەن وەرخـــێزۆ ئـــاشۆ
یـانەی ئـەغیاران گــرد بـەستەن کـۆکـۆ
هـــەی داد ئـەو رۆژە گـۆ و مـە گـۆ بـۆ
دەست داران بێ دەست بێ دەستان نۆبۆ
جـــاڕچی چـاڕ کـێشۆ یـە وادەی رۆ بـۆ
فـــەرمان شـــاهی تـورک و تـەتەر بـۆ
رۆرۆ زیـــــادتەر ســـتەم بـــەتەر بـــۆ
چوار گۆشەی جیهان گرد وە سەر هەنگ بۆ
ژ زوڵـــم زاڵـــم دڵ تـــەواو تـەنگ بـۆ
دەوران بـــوڕنەوی دوونـــادوون مـــەیۆ
هـەفت سـاڵە سـەد سـاڵ رەهـنموون مـەیۆ
نـە مـێهر نـە مۆبەت دڵ بێ زەوق مـەیۆ
وەشـــی زەمـــانە کــول چـون تـەوق مـەیۆ
مـونعمان مـوفلس گـرد بێ سووید مـەیۆ
ژ گـــەنجخانەی نـــەقد نـائوومید مـەیۆ
گـــەدایـان عـاجز لوقـمەی نـان مـەیۆ
ژ هەر گـۆشەی شـار چـەند بێ گیان مـەیۆ

گـــــورگ بـــاتنی وه شـــاران مـــه‌یۆ
مـه‌رگ بـێ ئـه‌جه‌ل په‌ی خـواران مـه‌یۆ
حـــاجیان حـــه‌جشان نـــاڕه‌واج مـه‌یۆ
ژ بـــێ زیـــنه‌تی کـــول مـوحتاج مـه‌یۆ
قـه‌رز داران بێ شـه‌رم جه لای خـوا مـه‌یۆ
ســاحیب قـه‌رز مـه‌حرووم بێ ته‌ما مـه‌یۆ
کـــناچان خـــه‌یلێ بـــێ‌حه‌یا مـــه‌یۆ
وه له‌فـــز وێشـان شـه‌وهه‌ر خـوا مـه‌یۆ
حـه‌لال ژ هـامسه‌ر سـه‌خت بـێزار مـه‌یۆ
بـــابۆ ژ فـــه‌رزه‌ن عـــاسی‌وار مـــه‌یۆ
هـــه‌زار و ســێسه‌د سـی و یـه‌ک مـه‌یۆ
ژ وه‌ســواس قـه‌حت دڵ پـڕ شـه‌ک مـه‌یۆ
پـــیران وه مـــورید بـه‌د ره‌فـتار مـه‌یۆ
مـورید نـه رووی پیر کـه‌ج گـوفتار مـه‌یۆ
یه‌ک مـوده‌ت نـه‌فه‌س پیر وه به‌ن مـه‌یۆ
پـــیر چـــون تـۆپ کـه‌ج بـزه‌ن مـه‌یۆ
خانه‌دان بێ شـه‌وق سـاف بێ نـوور مـه‌یۆ
له‌و وشک وکام تـاڵ چـون کـافوور مـه‌یۆ
چـــه‌ن ئـــاشۆ شـه‌ره‌ر زیـحه‌یات مـه‌یۆ
چـون ئـاخر سـه‌لات رۆی مـه‌مات مـه‌یۆ

ژ هــــەر ڕەزمئـارا مـەرگ بـێشۆ مـەیۆ
پــــەی زێــد و حـەیات هـەیاهۆ مـەیۆ
زهــــوور خـــرۆش نـە فـەرەنگ مـەیۆ
ئـــێرانـــی زەلیـل زەدەی چـەنگ مـەیۆ
غـولغولەی ڕۆمـات سـەروەردار مـەیۆ
وە حــــوکم مــــەوجوود کـردگار مـەیۆ
چـەند ئـەسیر، عـەبید نـە عـێراق مـەیۆ
چەند بەگلەرکوشتار چـەند دوساق مەیۆ
فــەڵەک گـەردوون تـۆز و تـەم مـەیۆ
چون غەوغای مەحشەر خەلق بەرهەم مەیۆ
دیـــوان ئـــەعلاگـورگ و مـێش مـەیۆ
دوورەنگ پەشیمان یەگزەنگ پێش مەیۆ
ژ زێـــد عـــوروس سـەرحـەساو مـەیۆ
جـەلادان بـێڕەحم چـون قـەساو مـەیۆ
ژ مــــــاوای عـــێراق زرێدار مــــەیۆ
پـــێشرەو مـــەهدی بـەر تـا بـار مـەیۆ
ســـین و ئـەلف و مـیم وە نـامش مـەیۆ
ســـەراســـەر جـــیهان وە کـامش مـەیۆ
هــەفتا و دوو دیـن وە یـەک دین مەیۆ
سـەر مـەزهەب نـە دەست بنیامین مەیۆ

نــوتق (خــانئەڵماس) ئــێدگــوفتار مـەیۆ
دەست دیــــــن شــا ئــاشکار مــەیۆ

*****

**واتە:** ئەی یاران شەڕ و هەرا بەرپا ئەبێ، ئەمە فەرمانی رۆژی بەرینە و شەڕ و کێشە دێتە دی، ماڵی بێگانەکان لە پشت سەر یەکدان، هەی هاوار بۆ ئەو رۆژەکەوت و ویرەی تیا ئەبێ، خاوەن دەسەڵاتەکان بێدەسەڵات ئەبن، جارچیان جاڕ ئەکێشن کە ئەوا بەرەبەیانە، فەرمانی شایی تورک و تەتەر دێتە دی، هەر رۆژ ستەم زیاتر ئەبێ، چوار گۆشەی جیهان پڕ لە پیاوانی شەڕی ئەبێ، لە ستەمی ستەمکار دڵ و دەروون تەنگ ئەبێ، رۆژگار هێشتا جوانە و ئەو خاوەنی دوو نادوونە، لە حەوت ساڵەدا سەد ساڵ خەڵک ئەخاتە بەرەوە، بەڵام خۆشەویستی لە دڵەکاندا نامێنێ، خۆشی زەمانە وەکوو ملوانکە ئەبێ، خاوەن سامانەکان بێسامان ئەبن، لەگەنج و سامان نائومێد ئەبن، گەداکان بە هیوای پارووێک نان ئەبن، لەگۆشەی هەر شارێکدا هەندێ بێ گیان ئەبن، گورگی دەروون لە شارەکان بڵاوە ئەکەن، مەرگی بێ ئاکام بە دووی دوژمنانی دین دادێ، حاجییەکان حەجیان ناڕەوا ئەبێ، بە هـۆی بـێ رێگـایی و نـالەباری هەموویان هەژار ئەبن، قەرزاران لە لای خوا شەرمەزار ئەبن، خاوەن قەرزەکان لە قەرزی خۆیان بێبەری ئەبن، کچەکان گەلێ بێ شەرم ئەبن، بە زمانی خۆیان داوای مێرد ئەکەن، ژن لە مێردەکەی بێزار ئەبێ، منداڵ لە باوکی یاخی ئەبێ، ساڵی هەزار و سێسەد و سی و یەک ی کۆچی ئەکا، دڵ لە دوو دڵی و قاتی و قڕیدا پڕ لە شک و گومان ئەبێ، پیران لەگەڵ لایەنگرانیا بەدڕەفتار ئەبن، لایەنگر لەگەڵ پـیرا قسـەی خراپ ئەکا، ماوەیێک هەناسەی پیر بەند ئەبێ، هەناسەی پیر وەکوو تۆپ هەڵەئەکا،

بنەماڵە کان تاسە یان لە دڵ دانامێنێ، لێوە کان وشک و کامە کان تاڵ وە ک کافوور ئەبێ، چەند بشێونە و هەرا بۆ خەڵک دێتە دی، لەو هەنگامەدا رۆی مەرگ ئەبێ، لە هەر شەڕێکدا هەندێ ئە کوژرێ و مەرگ دێتە دوویان، هەندێک لەم هەرایە بێ نیشتمان و ئاوارە ئەبن، شۆڕش و کوشتار بێ ئەندازە ئەبێ، ئەمەش ئەبێتە هۆی پرس و جۆی پێشەوایان، ئەوسا خرۆش و غەوغا لە فەرەنگدا پەیدا ئەبێ، ئێرانییە کان گیرۆدەی شەڕ و هەرا ئەبن، هێرشێکی گەورە بەرپا ئەبێ، هەمووی ئەمانە بە فەرمانی خوا ئەبێ، چەند دیل و یەخسیر لە عێراق دێت، چەند بەگلەر و گەورە پیاو ئە کوژرێ و چەندین کەس زیندانی ئەبێ، لە چەرخی گەردووندا تۆز و تەم بەرپا ئەبێ، ئەم هەرا و غەوغایە ئەڵێی لە رۆژی پەسلاّن دێتە دی، دیوانی هەرە بەرزی گورگ و مەڕ ئەبێ، دووڕووە کان و دوورەنگە کان پەشیمان ئەبنەوە و یە کڕەنگی دێتە بەرەوە، پاشان لە رووسەوە هێرش دێننە سەر ولاّتە کەمان، پیاوکوژان بە بێ بەزەیی خەڵک ئە کوژن، لە مەڵبەندی عێراق پیاوێکی زرێدار سەرهەڵئەدا، ئەو پێشڕەوی مافی مەهدییە و وشکی دەریا ئە کەوێتە ژێر رکێفی، ناوی ئەو سین و ئەلف و لامە (سام)، سەراسەری جیهان بە کامی ئەو ئەبێ، هەفتاو دوو دین ئەبێتە یە ک دین، و رێبازگە کە ئە کەوێتە دەستی بنیامین، قسەی (خان ئەڵماس) هەروایە.

*****

## (٣)

یـاران سـەرد مـەبۆ، یاران سەرد مەبۆ
دەوران فـــانی دەور ســـەرد مـــەبۆ
چــەند مـەردان خـاس وەنـامەرد مەبۆ
شۆنبەواران وە رای، راس وەرگـەرد مـەبۆ
حوبب حـەق نـە قـەلب یـاران کـەم مەبۆ
رۆشـنایی زەیـنان چـون پـای شـەم مـەبۆ
یـــاران جــە قــاپی حــەق وارەم مــەیۆ
وە ئـــەمر شـــەیتان خـــاتر جــەم مــەیۆ
شــەرارەی قــەلبان مــەیۆ وە یــەخ بــەن
نــەخش یــاریشان ساف مـەبۆ هـۆرکەن
گــورگ بــاتنی پــڕ مــەکــەی گــەزەند
نــە شـاران خـاس خـراو مـەکـەی چـەند
قــەدیم خــوفتەگــان چـەند مەیۆ بێدار
چـــەند ژ بـێداران خـوفتە مـەیۆ خـار
چــەند (بـەصەر) بـینا دەست دڵ تـەیار
مەیۆن وە بدەوکەش شەرمەندەی شەکبار
چەند مـەردان خـاس مـەمانۆن وە حـاڵ
نـە سـەدای یـاری لاڵ مـەیۆن چـون لاڵ

چەند ژ شەرت داران شەرت مەکەن بەتاڵ
مـەبۆن وە نـەزان سـەرسەری حـاڵحاڵ
کشمات مـەیۆ دەنگ نە سـەدای یـاری
بـوڵەند مـەو سـەدای تـەپڵ شـەکـباری
ســاحیب ئــوجاخان پـەی دنـیاداری
مـــەکـــەرن بـــنای مـەردوم ئـازاری
هـەر تـاکـە سـەدای یـاری مـەو بـوڵەند
بـوڵەند مـەو سـەدای نـاڵەی ریشخەند
رای حەق تەڵخمەیو رایناحەق چونقەند
ئەو وەخت مەیۆ وەخت قەرار چەنی هەند
بـۆی یـاری ژ لای یـەکـڕەنگی یـاران
مەبۆ وە بـۆی مـوشک قـوتووی عـەتاران
گـــوم نـــیشان مـــەیۆ نشـــانە داران
گـــوم قـەتار مـەیۆ سـاحیب قـەتاران
نـــە زوڵـــم زاڵـم دڵ مـەیۆ وە تـەنگ
خـــوار و زار مـەیۆ یـاران یـەکـرەنگ
رەنگـباز مـەردان دنیا مەکەی تـەنگ
دەنگ دەنگـــداران مـەدۆزۆ وە دەنگ
قاپی شاحەیدەر جـای هـووهووی یـاران
مـوراد دەهـەندەی کـول مـەتڵەب داران

ســـان ســـڵسڵە نـــیەن چـون جـاران
کـــەم مـــەیۆ سـەدای زەنگ زەواران
بگـــێرن دامـــان پـــادشای کـەرەمدار
وە یـــــەقین پـــاک بـــلاڵن وە زار
نـەی عـەسر سـەردە یـار یاهوو کـەران
نـــەچۆ وە زایـــە رەنـــج رەنـجبەران
بـەڵکە هـەر یـارێ زەردە گـڵ خـاک بۆ
ژ تـــیر تـــانەی دەروون بـێباک بـۆ
(ئەڵماس) کـەمتەرین شـەخس تـانە کێش
سـەردی را نـەدی یـار نـە قـەلب وێش

*****

**واتە:** ئەی یاران ژیان سارد ئەبێ، چەرخی گەردوون بە جارێ سارد ئەبێ، چەند پیاوی چاک نامەرد و بێ دەمار ئەبێ، بە رێی راست بڕۆن چونکە هەندێ لە رێـی راست دەرئەچن، دۆستی و خۆشەویستی خوا لە دڵەکان کەم ئـەبێتەوە، رۆشـنایی زانست وەکوو شەم کەم ئەبێ، ئەی یاران هەندێ لە درگای خوا دەرئەچن، بە فەرمانی ئەهریمەن دڵنیا ئەبن، پزیسکی دڵەکان وەکوو سەهۆڵی لێ دێ، نەخش و نـیگاری یارمەتی ئەوان لە ناو ئەچێ، دەروونی ئەوان وەکوو دەروونی گورگ پڕ لە رق و قین ئەبێ، چەند شاری باش وێران ئەبێ، چەند کەس کە لە مێژ خەوتبوون وریا ئەبنەوە، وە چەند کەس لە وریاکان ئەخەون، وە چەند پیاوی وریا و هوشیار، ئەبنە دەستکێش و

هەندێکیش شەرمەزار ئەبن، وە چەند پیاوی چاك هەر وەکوو خۆیان ئەمێننەوە، وە بە هۆی بانگی یارسان لاڵ و بێ دەنگ ئەبن، هەندێ لە پیاوانی چاك پەیمانی خۆیان هەڵئەوەشێنن، هەندێک ئەبنە گێل و نەزان، وە بە هۆی بانگ و نەوای یارسان مات ئەبن، وە دەنگی شک و گومانی ئەوان بەرز ئەبێتەوە، خاوەن وەجاخەکان بۆ خۆش ویستنی جیهان، دەست ئەکەنە ئازاردانی خەڵک، کاتێ کە بانگی یارسان بەرز ئەبێتەوە، ئەوان دەست ئەکەنە گاڵتە و تیتاڵی، رێی خوا تاڵ ئەبێ و رێ ناخوا وەکوو قەند شیرین ئەبێ، ئەوسا بڕیارێک دەرئەچێ، بۆنی خۆشی یارسان لە لای پیاوانی یەک رەنگ، وەکوو بۆنی موشکی بۆن فرۆشانی لێ دێ، نیشانەی نوێنگەی خوا لە ناو ئەچێ، وە خاوەنی قەتارەکان لەم هەرایەدا ون ئەبن، و لە ستەمی ستەمکار دڵەکان تەنگ و خەمبار ئەبێ، یارانی یەکڕەنگ زویر و زەبوون ئەبن، پیاوانی دوو روو جیهان بۆ خەڵک تەنگ ئەکەن، وە بە دەنگی ناڕەوایان خەڵک بە تەنگ دێنن، درگای شاحەیدەر ئەبێتە شوێنی پاڕانەوەی یاران، ئەو یارمەتی دەری هەموو یاران ئەبێ، بەڵام رێژەوانی ماف وەکوو پێشوو نابن، وە دەنگی بینەران کەم ئەبێتەوە، تا هەموو دەست ئەگرنە داوێنی شای هەرەبەرز، دەسا بە دڵێکی پاک و خاوێنەوە بپاڕنەوە، لەم رۆزگاری سارده یار سەر هەڵئەدا، ئیتر رەنجی رەنجبەران لە ناو ناچێ، بەڵکوو هەر یارێ کە دڵپاک بێ، لە تیری تانەی کەسانی تر بێباک ئەبێ، (ئەڵماس) کەمترین کەسی تانەکێشە، لەم رێی سارده دڵی پڕ لە تیشکی خوا ئەبێ،

*****

## (٤)

یـاران ئـیزهار بـۆ، یـاران ئـیزهار بۆ

شـەمەێی ژ وەسـف زهـوور ئیزهار بۆ

گۆش بدەن یاران هەر کەس هوشیار بۆ

فەرامۆش نەکەی هەرکەس گـۆشدار بۆ

زەمـانە وەی تـەور پـڕ سـتەمکار بـۆ

هـــەرجـــا یـــارێوەن زەلیـل زار بـۆ

جـــوملە بـــەدگۆیان بـە ئـیعتبار بـۆ

دەور نـــە کـام دڵ فـتنە و شـەرار بـۆ

دەور درۆ بـــــۆ راست نــادیار بـــۆ

راست وە شان و سەنگ کـۆنە مـەزار بۆ

بـــەدگۆ وە مــابەین جـفت ئـیقرار بـۆ

هـــامیار وە هـــامیار سـتێزە بـار بـۆ

حەق وەش گوڵ وەردە مەلەک تەیار بۆ

لاقـەید نـە دوعـای سـوب و ئێوار بۆ

بـاوەڕ ژ دیـن بۆزەین پـەردەی تـار بۆ

وە کەس کەس مەوین واحدولقەهار بـۆ

ســاحیب یـەقینان دوور ژ کـردار بـۆ

بـەعزیشان داخـڵ لوقـمەی موردار بۆ

سەدای یا عەلی ئکسیر وە یار بۆ
گرۆی یار وە نام خوار نادیار بۆ
موددەتێ دنیاوەی تەور قەرار بۆ
هەر ئاتەش‌خانە یەخ وە خەروار بۆ
ێی بەعدش وادەی هەن هەزار بۆ
روخسەت ژ مەهدی شای ساحبکار بۆ
گورگ باتنی وێڵ نە هەر شار بۆ
قەتڵ وکوشتارش وە بێ شمار بۆ
موستەفا مەئموور یاران و خوار بۆ
مەرگ فراوان بۆ دەرد نادیار بۆ
وەی‌تەور دەرد مەرگ وە بێ‌مدار بۆ
ژ هەر لا سەدای هاوار هاوار بۆ
یار هاوار وە جەم خوار و ئیمامان
ژ هەر لا مەیۆ سەدای ئەلئەمان
جیهان تەنگ مەبۆ ژ خەوف خایین
روخسەت مەسانۆ ژ شای بنیامین
مەیل مەرحەمەت شای ساحیبکار بۆ
بنیامین شاهۆ بارخانەش بار بۆ
هەر جە بۆی عەتارکارخانەی یار بۆ
وە بار بنیام تەمام تەیار بۆ

چەند قەتار ئوشتر قەتار قەتار بۆ
جوملە بارشان عەتر عەتار بۆ
بنیامین سەرمەست وەکلیدار بۆ
قەتار راهی بۆ بارخانەش بار بۆ
وادە هەر وادەی سای ساجنار بۆ
مەنزڵ وە سەرکۆی سەهەن قەرار بۆ
دوو بارخانە بەش وەتار بار بۆ
وە دەست بنیام قسمەت دیار بۆ
بۆی عەتر بەهەشت شادی یاران بۆ
وەبا و تاعوون گردی خواران بۆ
سەراسەر جیهان گشت سەربسات بۆ
تەمام (کلُّ شَیء) زندەی حەیات بۆ
هەفتا و دوو دین مەبۆ وە یەک دین
پادشا هەر سایەی وەزیر بنیامین
زەلیل زاڵم وە یەکجا جەم بۆ
تەمام بێ پەروا لاقەید ژ هەم بۆ
گورگ و ئاهوو و مێش، شێر چەنی شکار
وەحشیان کۆ بێ زۆر و زەوەردار
هیچ یەک نیگای بەد نمەکەی وەکەس
کەس قادر نیەن بکێشۆ نەفەس

تـەپڵ ساحیبکار سـەدای بـوڵەن بۆ

ئەو وەخت کە وادەی هـەزار و ئـەن بـۆ

یـارسان هـەرکـەس وە بـەخت وێتان

کـردار کـەردە مـەیۆ وە ڕێتان

هەرکەس نامەی وێش مە گێرۆ وە دەس

خاس مەدەن وە خاس گەس مەدەوە گەس

یـارسان زهـوور مـەولا وەی تـەورە

وە شـاوە ئـادەم ئـەو عـەهد و دەورە

وە شـەرتێ خـاکتان ژ زەردە گڵ بۆ

ساحیب مـایە بۆ دۆست هـام دڵ بۆ

نـوتق قـەدیمەن حـەق دادەن وایـە

ئـی نـوتق نـیهان بـۆ تـا وەخت وایـە

نـوتق (خـان ئـەڵماس) خـەتم کـەلامە

بـێ‌شک هـەر زهـوور هـا وەو ئـەیامە

*****

واتە: ئەی یاران هەموو شتێک ئاشکرا ئەبێ، باسێک لە سەر هەڵدانی شاتان بۆ ئە گێڕمەوە، گوێ بدەن یاران هەرکەس کە وشیارە، لە بیرتان نەچێ هەرکەس کە گوێ ئەدا، زەمانە بەم جۆرە کە ستەمکار بێ، هەرجێ یارێ بـێ زار و ڕەنـجوور ئـەبێ،

زۆربەی بەدگۆیان ئەبنە خاوەن بڕوا، ڕۆزگار بە پێچەوانەی ئـارەزووی دڵ پـڕ لە ئاژاوە ئەبێ، زەمانەی درۆ ئەبێ و راستی و دروستی لە ناو ئەچێ، راستی وەکـوو گۆڕێکی کۆنی لێ دێ، بەدگۆ لە نێوان پێ لێنان و دەربڕین ئەمێنێتەوە، یار لەگەڵ یارا لە شەڕ و هەرادا ئەبن، ماف وەکوو گوڵ جوانە و کەسێک کە وەکوو فرێشتە بێ، لە پاڕانەوەی بەیانی و شێو بێنیاز بێ، ئەم چەشنە کەسانە بەینی خۆیان بڕوایان ئەبێ، کەسێک بە بیری کەسێکی ترەوە نابێ جگە لە خوای مەزن، خاوەن بڕوایان دوور لە کردەوەی باش ئەبن، هەندێکیان بە پاڕووی مردار تێر ئەبن، دەنگی یا عەلی لە ناو خەڵکا لە لایەن یارەوە دێ، یاران بە بێگانەکان و بێدینان خۆیان پـێوەند ئـەدەن، ماوەیێک جیهان بەم جۆرە ئەمێنێتەوە، لە هەر ئاورخانەیێکدا سەهۆڵ بە خـەروار پەیدا ئەبێ، پاشان ماوەی مژدەی ساڵی هەزار ئەبێ، هافی مەهدی شای خاوەن کار ودمی خەڵک ئەدا، گورگی دەروون لە هەر شارێکدا ئـاوارە ئـەبێ، لەو دەمـەدا کوشتاری خەڵک بێژمار ئەبێ، مستەفا داودان راسپێری یاران ئەبێ، مـەرگ زۆر ئەبێ و دەرد و ناخۆشی پەرە ئەستێنێ، بەم جۆرە دەرد و مەرگ بە ئارامی دێتە دووی خەڵکدا، لە هەر لا دەنگی هاوار هاوار بـەرز ئـەبێتەوە، یـاران هـەموویان داوای کۆمەک لە پێشەوایان ئەکەن، لە هەر لاوە دەنگی هانا هەی هانا دێتە گوێدا، جیهان لە ترسی دڵپیسان تەنگ و تاریک ئەبێ، وە بنیامین ودم لە شای جیهان وەرئەگرێ، شا بەزەیی دێتە هەموو کەسێکدا، بنیامینی شاهۆیی بارخانەی خۆی بار ئەکا، هـەر لە بۆنی بۆن فرۆش کارخانەی یار دائەمەزرێ، و بە باری بنیامین یەکسەرە ئامادە ئەبێ، چەند قەتار وشتر لە پشت سەری یەکتر دێن، باریان پڕ لە بۆنی خۆشی بۆن فرۆشانە، بنیامین سەرمەست بادەی خوا و خاوەن کلیل ئەبێ، قەتار بارخانەکەی بار ئـەبێ و ئەکەوێتە رێ، پەیمان هەر پەیمانی هەتاوی خوایی ئەبێ، وە یاران لەکێوی سەهەندا نوان ئەگرن، دووبارخانە ئەبێتە هی یاران، و بە دەستی بنیامین بەش ئەکرێت، بۆی بۆنی خۆشی بەهەشت بە لووتی یاران ئەگا و ئەوان شاد ئەکا، بای چاوە قووڵکە ئەبێتە

بەشی گاوران و دوژمنانی دین، وە سەراسەری جیهان بۆ یاران ئەبێتە سەربسات، وە هەموو شتێ بۆ ژیان پەرە ئەستێنێ، حەفتاو دوو دین ئەبێتە یەک دین، سێبەری پادشا بنیامینی وەزیر ئەبێ، پیاوانی زەبوون و ستەمکار لە جێگایێکدا کۆ ئەبنەوە، هەموویان لە بەرابەری یەکدا بێ پەروا ئەبن، گورگ و ئاسک و مەڕ و شێر، کێوی‌یەکانی کێو بە هێز و بێ هێز، هیچ کامیان سەرنجی خراپ بە یەکتر نادەن، هیچ کەسێ ناتوانێ هەناسە هەڵکێشێ، تەپڵی شا دەنگی بەرز ئەبێتەوە، ئەوکاتە دەمەدەمی هەزار و هەند ئەبێ، ئەی یارسان! هەر کەسێ ئەبێ بە بەختی خۆی سەرنج بدا، چونکە هەرکەس بە کردەوەی خۆی هەڵیئەسەنگێنن، هەر کەسێ نامەی خۆی ئەدەنە دەستیەوە، چاک ئەدەنە چاک و خراپ ئەدەنە خراپ، ئەی یارسان! سەر هەڵدانی سەرۆک بەو جۆرە ئەبێ، خۆزگەم بە پیاوی ئەو زەمانە، بە مەرجێ کە دڵیان پاک و خاوێن بێ، خاوەنی مایە بێ و لەگەڵ ئاوەڵانا یەکدڵ بێ، ئەمە قسەی ڕۆژی بەرینە و خوا ئەوەیە بەخشیوە، ئەم قسە ئەشارێتەوە تاکوو کاتی خۆی بگا، قسەی «خان ئەڵماس» دوایی قسەکانە، بێ گومان سەر هەڵدانی شا لەم ڕۆژانەدا ڕوو ئەدا،

*****

## (٥)

یـــاران حـــەق وەش، یـــاران حـەق وەش
بـــیان بشـــنەوان یـــاران حـــەق وەش
مسکـــین، فـــەقیران جـــەور جـەفاکـەش
فەردا رۆی حـەساو هـەر یـەک شـارێ بـەش
ژ سـەنەی هـەزار، سێـسەد و سـی و شـەش
بـــۆی حـــەق مـــەیۆ ژ قـــاپی ئـــاتەش
ئـــەو جـام جـورعە بـنیام مـەکـەی بـەش
ژ بـــۆی عـــەبیرش یـــار مـەبۆ سـەروەش
نـــووروواران مـــەبۆ ســـارا و کـۆ و کـەش
نـــە جـــای یـەخ بـەنان مـەخێزۆ ئـاتەش
مـــەلەک تـەیارێ حـەرف و کـەلام وەش
بـــەرمەشۆ نـــە قـــەڵب وە حـوکم ئـاتەش
رەهـــــــنمایان بـــەش بـــڕیای بـــێبەش
بـیوەری و مـەحرووم رووسـیا و روو رەش
بـــەرمەشۆ نـــە قـــەلب تـاریکی هـەوەش
رۆشـــن مـــەو وجـــود وە حـوکم ئـاتەش
مـەیۆ وەکـەرەم هـەم حـەق و حـەق وەش
بـۆی یـاری وە یـار حـەق مەکـەرۆ خـوەش

وەی تەور کوورەی عەشق مهران وە تاو بۆ
حەقگۆ پەی حەقگۆ چون تشنەی ئاو بۆ
ئاشنا پەی ئاشنا نە خورد بۆنە خاو
مەگێلاْن پەی هەم وە تاجیل و تاو
یەک موددەت یاران وەی تەور مەو سەروەش
ژ نۆ هەمرەنگێ مەڕژۆ ئاتەش
سێ رۆ مەگێرۆ مەهتاب مەهوەش
نشانەی جەنگەن کینەی کەشاکەش
ئێران و توووران، هند چەنی حەبەش
زەنگی زەنگەوار جەم زەرد و رووورەش
جومجومەی جیهان مەیۆ سپاکەش
مەرکەب سواران ماران کۆ و کەش
ماران بەش دارەن سواران بێبەش
ماران یار مەون وە حوکم ئاتەش
ئەوەن سپای خوار وە بێ شمار بۆ
گردی یار وە نام خوار نادیار بۆ
ژ مولْک عێراق مەیۆ سەرداریْ
چون سام وەرین گران سواریْ
ئەو هەم وە ئیسمەن هەم سالْەن نامش
عالْەم مەلەرزۆ وە زۆر سامش

ئـــــەو زەڕێ نـــە زات ســـاحیبکار دارۆ
ژ دیـــدەش غــەزەب پـەی خــوار مــەوارۆ
ســـاحیب زاتـــەن ئـــەو نـــەخان ئـاتەش
کـــوشتار مـــە کـــەرۆ لەش وە بـــان لەش
نـــە کـــوشتار ســـام ســاحیب زات و زوور
ئسـرافـیل نــە عـەرش دەم مەدەی وە سـوور
نـــە کـــوشتار ســـام نـە غـوڕشت سـوور
پـــەیدا مـــەو مـەهدی مـەولای لاقســوور
ســـەیف دوو ســـەرش مـــە کـێشۆ شـەرار
غـلاف کـەش مـە کـەی پەی کـوشتار خـوار
بـــەرق دەم تـــێغ پـــەنجەی شـــاحەیدەر
لاشـــە کـــۆ مـــەیۆ ســـارا و دەشت و دەر
ئـــاتەش مـــەوارۆ ژ ســـەیف دووســـەر
مـــــەخێزۆ لێشـــان شـــەرارەی شـــەرەر
ژ بـــــڕشت تـــێغ زۆر شـــا حـــەیدەر
زەڵاڵـەت مـە کـەی حـووت چـەنی بەقەر
خـــواران ژ هـــەیبەت جـــەور بـێ‌سامان
عـــاجز مـەون ژ جـەنگ مـەخوازن ئـامان
مـــوسڵمان مـــەون ج گـــەورج کـــافەر
مـە کـەن زیـارەت ئـەو سـەیف دوو سـەر

تـــەمام زيـــحەيات دنـــيا و بـەحر و بـەر
سەف سەف، سەف مەدە نەدەور حەيدەر
پـەرێ يـارسان دەور مـەكـەی يـەكسـەر
مــوجاور مــەيۆ ســپای نــيكی چـەر
نـۆسەد نـۆسەد دەی سپای شـاخوەشين
مــــەقامات وانــــان پـــەرێ زەوق ديـــن
زەمــــزەمەی نــۆسەد تـــەپڵ ســـاحيبكار
پـــڕ ســـەدا مـــەبۆ جـــيهان بـەڕ تـا بـار
ســـەراســـەر ســـپا چـــەند هـەزار هـەزار
هـــەتا ســـەهەند كـــۆ مـــەگـێرۆ قـەرار
نـــۆسەد دە وە بـــەزم شـــيرين كـــەلامان
ســـان مـەدەن سپا يـەكـڕەنگ غـولامان
شـارەزوول فـەرمان مـەخفی خـان ئـاتەش
وەگـــردی يـاران ئـەو رۆ مـەكـەی بـەش
قســـمەت مـــەكـــەرۆ شـا وە دەس وێش
هەركەس يەكڕەنگەن كۆشكێ مەدەی پێش
جــــە مــــاران پــــاک ريــــازەت كــێشان
هـــەر يـــەكـێ شـارێ شـامەدەی پـێشان
فكـر و خـەيالّ كـەن هـەركەس كـە خـامە
يــاد ئـــەو رۆكــەن وەش ئـەو ئـەييامە

## ئیسه دەفەرد جە نوتق (خان ئەڵماس)
## وە قەوڵش مەیۆ یاران ئیخلاس

*****

**واتە:** ئەی یاران ڕێگەتان چاکە، وەرن قسەی ڕاستەقینە ببیسن، هەژاران ستەم ئەکێشن، لە ڕۆژی ژماردا هەرکام لەوان پاداشتێکیان بەر ئەکەوێ، لە ساڵی هەزار و سێسەد دو سی و شەشی کۆچی، بۆی ڕاستەقینە لە درگای ئاتەش بەگ هەڵئەسێ، ئەو قومێ بادە لە جامی بنیامین لە نێوان یاران بەش ئەکا، و لە بۆنی خۆشی ئەوە یار سەر خۆش ئەبێ، دەشت و کێو تیشک باران ئەبێ، لە جێی سەهۆڵبەندان ئاگر هەڵئەسێ، فریشتە خۆیی قسە خۆش، بە فەرمانی ئاتەش بەگ دڵەکان‌داگیر ئەکا، ڕێنمایان و ڕێ پیشاندەران کە لە بەشی خۆیان بێ‌بەری ئەبن، لە بەرابەری خوادا نائومێد و ڕوو ڕەش ئەبن، تاریکی دڵەکان دائەگرێ، و بە فەرمانی ئاتەش‌بەگ جیهان ڕوون ئەبێتەوە، خوا بەزەیی دێتە هەموو کەسێک‌دا، و بۆنی خۆشی یارسان دڵی یاران خۆش ئەکا، بەم جۆرە کوورەی ئەوین لە دڵەکان‌داکاری کرد، و یاران بۆ بیستنی قسەی خوا تینوویان ئەبێ، ئاشنا بۆ ئاشنا نە خوردی هەیە و نە خەو، و بۆ یەکتر بە پەلە ئەگەڕن، ماوەیێک، بەم جۆرە سەرمەست ئەبن، تا ئەوەی هاوڕەنگی ئاگر ئەبن، ئەو سا سێ ڕۆژ مانگەشەو جیهان داگیر ئەکا، ئەمەش نیشانەی شەڕ و کینە و کێشە کێشە، هەندێ لە خەڵک ئێران و توران و هند و حەبەش، وە زەنگەوار لە بەرابەری خوا نافەرمانی ئەکەن، سپاییەکان لە جیهان دا ئەکەونە جم و جووڵ، ئەسپ سوارەکان و ماران لە کەژ و کێودا ئەکەونە هەوڵ و تێکۆشان، مارەکان ئەبنە خاوەن بەش بەڵام سوارەکان بێ‌بەهرە ئەبن، مارەکان بە فەرمانی ئاتەش بەگ ئەبنە یار و هاودەم، لەشکری بێگانەکان ئەوەندە زۆر ئەبن، کە هەمووی یاران لە بەرابەری ئەوانا دیار نابن، لە وڵاتی عێراق سەرۆکێک دێ، وەکوو سام سوارێ بە هێز ئەبێ، ئەو ناودارە و ناوی سامە، هەمووی خەڵک لە هێزی ئەو ئەترسێ، ئەو تۆزقاڵێک لە خاوندکار ئەچێ، وە بۆ بیگانەکان لە چاوی ڕق ئەبارێ، ئەو خاوەن شکۆیە و شکۆی لە ئاتەش بەگەوە وەرئەگرێ، و

بێ‌دینان ئەکوژێ لەش ئەکەوێتە سەر لەش، و لەکوشتاری سام ئەو خاوەن شکۆ و هێزە، ئیسرافیل لە ئاسمانەوە شاخنەفیر لێ ئەدا، و لەکوشتاری سام و لە دەنگی شاخنەفیر، مەهدی سەرۆکی هەرەبەرز سەری هەڵئەدا، شمشێری دوو سەری باپیری ئەکێشێ، و بۆ کوشتاری ناحەزان و دوژمنانی دین لەکێلان دەری ئەهێنا، لە بریقەی شمشێری پەنجەی ئەو شێرە، لاشە لە دەشت و کێوا کۆ ئەبێتەوە، لە شمشێری دوو سەری ئاور ئەبارێ، لەوە پزیسکی ئاور هەڵئەسێ، لە بڕشتی شمشێری عەلی، نەهەنگ و مانگا ئەکەونە گریان و زاری، بێ دینان لە ترس ئەودا، لە شەڕ زەبوون ئەبن و داوای هانا ئەکەن، ئەبنە موسڵمان چ گەور و چ بێ دین، ئەو شمشێرە دوو سەرە ماچ ئەکەنەوە، و تەواوی گیاندارانی دەشت و دەریای ئەم جیهانە، ریز ریز لە بەرابەری عەلی‌دا رائەوەستن، بۆ یارسان رێ ئەکرێتەوە، و لەشکری نیکی چڕ ئەبنە ئاوسێیان، ئەوسا لەشکری شاخوەشین کە بە نۆسەدە ناسراوە، ئەکەونە پاڕانەوە لە خوای گەورە و گران، وت و ویرەی لەشکری نۆسەد نۆسەد دەو دەنگی تەپڵی خاوەندکار، لە دەریا و دەشت دەنگی دایەوە، سەراسەری لەشکر چەند هەزار هەزار، تاکوو کێوی سەهەند رائەوەستن، لەشکری نۆسەد نۆسەدە بە بەزمی پیاوانی قسە خۆش، لەگەڵ خولامانی یەکرەنگ‌دا سان ئەدەن، لە شارەزووردا فەرمانی شاراوەی ئاتەش بەگ، لە ناو یارانی بڵاو ئەبێتەوە، ئاتەش بەگ ئەوە بە دەستی خۆی دابەش ئەکا، و هەرکەس کە یەکرەنگ بێ بەشێک بە ئەو ئەدرێ، لە مارانی پاک کە بۆ خوا کار کەن، بە هەر کام شارێک ئەسپێرێ، هەرکەسێک کە بیری خاوە ئەبێ بیر بکاتەوە، وە یادی ئەو رۆژە بکا و خۆزگە بەو رۆژە، ئێستا دە هۆنراو لە قسەکانی (خان‌ئەڵماس) دێنین، یارانی خۆشەویست ئەوە وەرئەگرن.

*****

## (٦)

هـۆشیاران هـۆش، هـۆشیاران هـۆش
گـۆش بـدەن یـاران هـۆشیاران هـۆش
نـوتق ئـەزەڵ رۆ شـای قـرمزی پۆش
فەرموودەی حەقەن مەکەن فەرامۆش
ئـــاینەی زێـڵم ئـاوەردەن خــرۆش
بواچم زهـوور بـادەی کـەوسەر نـۆش
جە ساڵ هـەزار، سـەد و سـی و چـوار
واتـــەی وەریـــنان بـــواچــم گـــوفتار
پـــادشایێ مـــەیۆ بـــە نـــام عـــەبباس
ئـەولادەی سـەفی ئـەو بیەن وە راس
ژەو بـەعد نـادرێ مـەکێشۆ شـەرار
ســـپاێ خـــارجـــی فـــرار مـــەو فـــرار
مـــەسافش وێـــنەی وەریـــنان مـــەیۆ
عـــەدل عـــەداڵـــەت قـــەدیمان مـــەیۆ
موددەتێ نەو تەخت شـاهی قـەرار بـۆ
دیـــوان حـــوکمش هـــەنی هـــەزار بـۆ
تـازەڕەی جـە زات حـەق نـەبارش بـۆ
عـــەدڵ عـــەداڵـەت جـە رەفتارش بـۆ
نەو دەم کە قەلبش جە نوور عـاری بـۆ
زوڵـــم زەلاّلـــەت، ســـتەمکاری بـــۆ

ریشەی جەرگ وێش، مەرگش هانەدەس
جە تێغ میسری ئەو مەکەرۆش قەس
ژەو بەعد چەندین شا مەگێرۆ قەرار
هەم جەنگ هەم راحەت جە ئێران دیار
یەکێ پەیدا مەو جە عێل قاجار
نە تەخت شاهی مەگێرۆ قەرار
ئەو ناسر وە نام عەداڵەت مەیۆ
بەدخوا و بەدگۆ خەجاڵەت مەیۆ
پەنجا ساڵ ئەو شا سەڵتەنەت مەیۆ
وەش عەهد و ئەییام وە رفعەت مەیۆ
مەئموور مەرگیش رەزا نام مەیۆ
شاهیش پایماڵ ناتەمام مەیۆ
سێ فەرزەن ئەو ژ نۆ شا مەیۆ
نەسڵ ئاخرین ئەحمەد نام مەیۆ
یەکێ پەیدا مەو جە پۆپەی ئەییام
نەسڵ قاجاران مەکەرۆ تەمام
شەرارەی زۆرش مەکێشۆ شەرار
موددەتێ وادەی شاهیش بەرقەرار
یەک موددەت دەوران خاس بەرقەراربۆ
نشانەی گوڵشەن عاڵەم دیار بۆ
هەزار و سێسەد هەنی زیاد تەر
ئاسار تەڵخی مەکێشۆ شەرەر

ساڵ تاریخش سێسەدو پەنجاو هەشت
چوارگۆشەی جیهان مەیۆ وە جەمشەت
گــردی مــلەتان مــە کــەرن خـرۆش
هوون وێنەی لافاو مەجۆشۆ وە جۆش
سەدای قەوا قوو هەی هەڵای فەرەنگ
ئێران زەلالەت زەلیـل زەدەی جـەنگ
جە یەک لا مەرگەن جە یەک لا قەحتی
یـەک لا زوڵـم زۆر بێچاران سـەختی
مــە کــەرۆ حــاشا بــا بۆ نـە فـەرزەن
مەواچـن وە یـەک حـەرف نـاپەسەن
زارۆ جـــە دایــەش مــەیۆ دڵ ئــازار
حــەڵاڵ جـە هـامسەر مـەکـەرۆ فـرار
زەرێ رەحم نە قەلب ساحیب رەحم نیەن
حـــاجیان کــابە جــە یــادان شــیەن
نــە زکــر تــەسبیح سۆفی دەروێشـان
نــە جــای عــبادەت ریـازەت کـێشان
تەمام خـەلایق هـەرکەس پـەرێ وێش
وەسوەسەی شەیتان مەکەرن وە پێش
خــەریدار نـە فکـر حیلەی رەدبـازی
حـەق وە نـاحەق کـەر تـەرازوو بـازی
نە رەحم نە مروەت نە دین نە ئینساف
پــەرێ دنــیایێ مــە کــەرن ئجحاف

نــه عـاڵەم دەسـتوور ئـەمانەت کـەرۆ
نــه سـۆفی جــه رای دیــانەت بـەرۆ
نــه مــورشید ئــایەی عــرفان بــوانۆ
نـــه تـــاڵب ئــاداب تــەریق بــزانــۆ
نــه پــیران وه فکــر رەفتار خـاس بۆ
نه پـیر پـەرێ پیر سـدقش ئـخلاس بـۆ
زەلزەلەی جــیهان واوەیــلای ئــەسیر
خانەدان پەشێو شـاهان مـەو دەسگـیر
ســـەدای وانــەفسا جــه دنــیا مــەیۆ
بـــێ شـــەرم و حـــەیا بــەرمەلا مــەیۆ
سەروەرێ مـەیۆ نـه رووی سـەربسات
مــونعم و مـوفلس تـەمام مـەبن مـات
تــەمامی جــیهان تــا خـاک قـەیسەر
قەتڵ و کوشتار بۆ نـامداران یـەکسـەر
چەند شاران خاس یەکسـەر خـراو بـۆ
زەهرەی نامداران یەکسـەر وه ئـاو بـۆ
جـه ئـەرز تـا سـەما وه قـیل و قـال بـۆ
پــایتەخت شــاهان گــرد پــایماڵ بـۆ
ســاحیب مـەزهەبان بـێ یـەقین مـەیۆ
ســـێلاو ســـەردی ســەرزەمین مــەیۆ
نــــایافت قـــەدیم ئـــوجاخان مـــەیۆ
یــــه نــوتق شـــەریف ئـیمامان مــەیۆ

پایتەخت شاهان ساف وە گەرد مەیۆ
هـۆش هـۆشداران جـە را رەد مـەیۆ
خـرۆش ئـاشووب نـە جـیهان مـەیۆ
زوڵـم و زۆر و سـەخت بێچاران مـەیۆ
جە چوار جانب سـەدای دەنگ مـەیۆ
چون رۆژ مەحشەر شەوە زەنگ مـەیۆ
قـازی گشت نـە فکـر کـار بـەد مـەیۆ
شـێخان کـول گـومڕا وە را رەد مـەیۆ
سـۆفی دەروێشـان گـرد زەلیـل مـەیۆ
خـــەلیفە عـاجز دڵ مـەلوول مـەیۆ
مـەزڵوومان دڵـتەنگ زاڵـم شـاد مـەیۆ
حاکـمان بێ عـەدڵ وە بێ داد مـەیۆ
ئـوجاخان تـەمام بێ هـممەت مـەیۆ
مـەردان ئیخلاس بـە قـیممەت مـەیۆ
پـیران پـەرێشان مـورید مـات مـەیۆ
بـوهتان فـراوان جـە وات وات مـەیۆ
ژەنان بـە عسـمەت بێ سیرەت مـەیۆ
مەردان بێ نامووس بێ غـیرەت مـەیۆ
دیـن راگـەی حـەق شکسـتە مـەیۆ
پەنج وەختەی نـماز دیـن بـەستە مـەیۆ
سـەید سـادات سـەرگەردان مـەیۆ
خـلاف و گـەزاف نـامەردان مـەیۆ

زوڵـم و زەلالەت چوار قـورنە مـەیۆ
ســـەیف نـــا کــەسان بـڕنە مــەیۆ
خــــەلایق بــــێزار نــە عــەیال مــەیۆ
بێ تەقوا و تـاعەت بـێ حـەلاڵ مـەیۆ
کوشتار بێ سـامان وە بـێ حـەد مـەیۆ
هوون وێنەی لافاو جە سەرحەد مـەیۆ
تــۆپان وە زەمــین سـپا شــەق مـەیۆ
تــەیران وە هــەوا مــوعەللەق مــەیۆ
مــەشرق تــا مـەغرب بـاخەبەر مـەیۆ
شــــەرارەی شــەرەر پــڕشەرەر مــەیۆ
بــــێسیم تـنەناف خـەبەروەر مــەیۆ
ئــــەسپ ئـــاسنی وە رەهــبەر مــەیۆ
تــۆپان جــە هــەوا ئـاراسـتە مـەیۆ
بــەحری بـەحریان پـیراسـتە مـەیۆ
ئافتاو و مەهتاو هەر دوو هـەر تـار بـۆ
نەعرەی شا حەیدەر جـە سـاڵ مـار بـۆ
نەو دەم کە کـوشتار بـێ سـامان مـەیۆ
خــالق هـاوار وە لوتـف ئیمان مـەیۆ
ئــەوسا سـەرداری سـەروەردار مـەیۆ
وە ئــــەمر فـــەرمان کــردگار مــەیۆ
ئــــەو جـــە مــەدینە زەڕەدار مــەیۆ
جـاڕچی هـدایـەت سـاحیبکار مـەیۆ

سین و ئەلف و میم وە نامش مەیۆ
بەڕ و بووم و بەحر، وە کامش مەیۆ
شەرارەی شەرەر وە سەیفش مەیۆ
کوشتار کافر وە کەیفش مەیۆ
جەولان مەدەرۆ سارا و کۆ و کەش
کوشتار مەکەرۆ لەش وە بان لەش
داد بازخواست جە زەنگان مەیۆ
دوورەنگان دین پەشیمان مەیۆ
هەفت تەنەی هەفتەن جە نەوڕاس مەیۆ
جە سوڵتانیە بازخواس مەیۆ
تەمام ملەتان وە یەک دین مەیۆ
یەک تەرزیەک ڕەفتاریەک ئایین مەیۆ
نەعرەی بانگ بەرز خوەشین شا مەیۆ
ئیقرار کەردەی کانەپا مەیۆ
شەست چەنی هەزار ساڵ مار مەیۆ
نەعرەی حەیدەری زولفەقار مەیۆ
ئەمان ئەلئەمان هەر دیار مەیۆ
وارەمان وە بەدگرفتار مەیۆ
زوانەی سەیفش پڕ شەرار مەیۆ
ساعەتێ کوشتار سەد هەزار مەیۆ
نەعرەی شاحەیدەر شەقەی زولفەقار
ژ هەر دەر مەیۆ ساتێ چەند هەزار

جه خەلق مەخێزۆ سەدای ئەلحەزەر
مەکەن زیارەت ئەژدەهای دوو سەر
ئـیمان مـاوەران تەمامی ئەغیار
شـەهادەت مەدەن سغار و کوبار
وەحشی وەحشیان تەمام بەحر و بار
زاڵـم و مەزڵووم بێ زۆر و زۆردار
مەولام مەنیشۆ وە تەخت یاقووت
وە سام سەنگین هەم وە جەبەرووت
وە سام سەنگین شای دوڵدڵ سوار
پەی ئەحواڵ پەرسان مەکەرۆ گوفتار
جـبرەئیل وەزیـر بنیامین وە نام
میکاییل مونشی پیر مووسی مەقام
ئسرافیل داوود، سوورش ها وە دەم
عـزرائیل مچە پەی قەبز ئادەم
ئەوساکە وادەی ئەحواڵ پەرسانە
زبـان لەنگ و لاڵ هەم وە دەهانە
ژەو پەرسان شا چێش داریهەواڵ
عەرزکەی وە حزوور میر بەرز ئیقباڵ
مسـتەفا مەئموور تیر نە کەمانە
هەرکەسێ پاکەن دارۆ نیشانە
ئیتر هیچ کەسێ لێش مەدۆ تانە
لایـق نە حزوور والا مەکانە

روو سفید نه لای شای ساحیب کەرەم
لاقـــەید ژ حـــەرام دیـــنار و درەم

قـەدەم پـێش بـنی وە یـاهوو مـەنهۆ
وە دەست بـنیام شـەربەت مـەنۆشۆ

هەرکەس دنیا دار بێ تەقوا و تـاعەت
نـە حـزوور شـا مـەبۆ خـەجاڵەت

پـەی جـیفەی دنـیا عـوقبادا وە بـاد
ژ ئـــەحواڵ پـەرسان نـەمەبۆ ئـازاد

رەنگ زەرد و زەعیف سەرئەفکەندە بۆ
رووسیا و روورەش هەم شەرمەندە بۆ

موددەتێ نەو دەم پاک مەکەی جیهان
مەدەی حکوومەت وە خـوان شـاهان

دنـیا هـەم ژ سـەر مـەگـێرۆ قـەرار
عـەدڵ عـەداڵـەت هـەم بەڕ تـا وەبـار

یـاوەران زهـوور سـاحیب زولفـەقار
وە شـۆن کـەلام ئـی وادە و ئـیقرار

نوتق (خانئەڵماس) ئێدش ئیزهارەن
زهوور حـەزرەت وەی تـەور دیـارەن

*****

واتە: ئەی هۆشیاران وئەی یارانی بە هۆش، گوێ بگرن ئەی یـارانـی وشـیار، قسەی بەرینی شای قرمزی لەبەرکەر، قسەی راستە و ئەوە لە بیر مەبەنەوە، ئاینەی دڵم

هاتووەتە خرۆش، ئەبێ سەرهەڵدانی هافی مەهدی کەوسەر نۆش بڵێم، لەساڵی هەزار و سەد و سی و چواری کۆچی، قسەی پێشیتتان بۆ بگێڕمەوە: پادشایێ دێ بە ناوی عەباس، کە لە منداڵە کانی سەفی یە و ئەو رێ راست ئە گرێ، لە دوای ئەو کەسێک بە ناوی نادر وە پزیسک سەر هەڵئەدا، و لە شکری دەرەوە لە دەستی هەڵدێ، شەڕی وە کوو پێشینیان ئەبێ، لە داد و دادگەری وە کوو رابردووە کان رەفتار ئەبێ، ماوەیێک لە سەر تەختی شایی دائەنیشێ، وە دیوان و فەرمانی ئەو تا هەزار و هەندێ پەرە ئەستێنێ، تا تۆزقاڵێک لە گەورەیی خوا لە هەناسەی ئەودایە، داد و دادگەری لە رەفتاریا دیارە، ئەو دەمە کە دڵی لە تیشک لابدا، ستەم و ستەمکاری رووی تێ ئە کا، ریشەی ژیانی سەرئەنجام لە بنەوە ئە کەنرێ و مەرگ دێتە دوویا، و بە شمشێری میسری ئە کەوێتە دووی ئەو، لە دوای ئەو چەندین شا دێنە سەر تەخت، هەم شەڕ و هەم ئاشتی لە ئێران دا دیار ئەبێ، پاشان پیاوێک لە عێلی قاجار سەر هەڵئەدا، ئەنیشێتە سەر تەختی پادشایی، ناوی ئەو ناسر و سەرەتا دادگەر ئەبێ، پیاوی خراپ لە بەرابەری ئەو شەرمەزار ئەبێ، پانزە ساڵ پادشایی ئەو بە ئارامی تێ پەڕی، پادشایی ئەو بەخۆشی چووە سەر، لە دوای پادشایی یە کەی پیاوێ بە ناوی رەزا بووە هۆی مەرگی، شایی ئەو پاماڵ بوو، و کۆتایی پێ هات، سێ کوڕی ئەو لە نوێ ئەبنە شا، دوایین وەچەی ئەو ناوی ئەحمەدە، لەو رۆزگارەدا یە کێ پەیدا ئەبێ، و رەچەڵە کی قاجاری یە کان لە ناو ئەبا، پزیسکی زۆری دا ئە گیرسێ، و ماوەیێک پادشایی ئە کا، ماوەیێک بە سەر خەڵکا پادشایی ئە کا، پاشان ئێران وە کوو گوڵستانی لێ دێ، لە ساڵی هەزار و سێسەد و هەندێ، شوێنەواری تاڵی پەیدا ئەبێ، ساڵی هەزار و سێسەد و پەنجاو هەشت، چوار گۆشەی جیهان ئەبێتە بزووتنەوە، هەمووی نەتەوە کان تێ ئەخرۆشن، خوێن وە کوو لافاو رەوان ئەبێ، بانگ و هاواری خەڵک لە بەرابەری فەرەنگە کان بەرز ئەبێتەوە، و لە ئێران هەنگامە و هەرا دێتە دی و وڵات ئە کەوێتە ناو شەڕ و شۆر، لە لایێک مەرگ و لە لایێک قاتی و قڕی، لە لایێک زۆر و ستەم و خەڵکی بێچارە لە سەختی دا ئەژین، کوڕ لە باوک حاشا ئە کا، و بە یە کتر قسەی خراپ ئەڵێن، منداڵ لە دایکی ئەڕەنجێ

ژن لە مێردەکەی هەڵدێ، تۆزقاڵێک بەزەیی لە دڵ خەڵکدا نامێنێ، حاجی یەکان کەعبە لەبیر ئەبەنەوە، نە پاڕانەوە ولالانەوەی دەروێشان و سۆفی یەکان ئەمێنێ، و نە جێی پەرستنی خوا ئەمێنێ، دوو دڵی ئەهریمەن ئەگرنە بەر، کڕیار لە بیری فڕ و فێڵ ئەبێ، ماف ئەکەنە ناماف و تەرازوو بازی ئەکەن، نە بەزەیی ئەبێ و نە پیاوەتی و نە دین و نە جوامیری یێک، وە لە جیهاندا زۆر و ستەم ئەکەن، وە لە جیهانی تر راسپاردە و دروستکاری نامێنێ، سۆفیەکان لە رێی خوا دەرئەچن، رێبەری ئایینی ئایەی خواناسی ناخوێنێ، وە قوتابی رێ و رەوشتی خۆی لە بیر ئەباتەوە، نە پیران لە بیری رەفتاری چاک ئەبن، و نە پیر لە راستی و دروستیدا ئەژی، لە جیهان بوومەلەرزە رووئەدا و دیلەکان لەگریاندا ئەبن، بنەماڵەکان پەشێو ئەبن و شاکان دەستگیر ئەکرێن، دەنگی ئای لە من لە جیهاندا بلاو ئەبێتەوە، خەڵکی بێشەرم رازیان دەرئەکەوێ لەم ولاتەدا سەرۆکێک سەر هەڵئەدا، ساماندار و هەژار هەموویان مات ئەبن، و لە تەواوی ئێران تا ولاتی قەیسەر، ناوداران و سەرۆکان ئەکوژرێن، چەند شاری باش بە جارێ وێران ئەبێ، زراوی پیاوانی گەورە ئەبێتە ئاو، لە زەوی و ئاسمان قڕە و کێشە هەڵئەسێ، پایتەختی پادشاکان پامال ئەبێ، خاوەن رێبازگەکان بێ بڕوا ئەبن، سێلاو و ساردی زەوی دائەگرێ، خاوەن وەجاخەکانی کۆن نایاب ئەبن، قسەی پێشەواکان ئەگەنە گوێ، پایتەختی شاکان ئەبێتە گەرد و تۆز، وتە و پێشنیاری پیاوانی وشیار بەرپەرچ ئەدرێتەوە، جیهان پڕ لە بشێونە و غەوغا ئەبێ، وە زۆر و ستەم داوێنگیری بێچارەکان و هەژاران ئەبێ، لە چوار گۆشەی جیهان دەنگی تۆپ و تفەنگ دێ، وەکوو رۆژی دوایی جیهان تاریک ئەبێ، داوەر لە بیری کاری خراپ و ناپەسەند ئەبێ، شێخەکان هەموویان گومڕا ئەبن و ژیان لەگومڕاییدا ئەبەنە سەر، سۆفی یەکان و دەروێشەکان زەبوون ئەبن، خەلیفە زار و زگار و دڵتەنگ ئەبێ، ستەم لێکراوان خەمبار و ستەمگەران شاد ئەبن، فەرمانڕەوایان بێ داد ئەبن، وەجاخان تەواو بێ بیر و کەڵکەڵە ئەبن، و دڵپاکی پیاوانی کەم ئەبێ، پیران پەرێشان و لایەنگران مات ئەبن، بوختیان و قسەی بێهوودە زۆر ئەبێ، ژنانی بە ئابڕوو ئابروویان نامێنێ، پیاوان لە

بێ‌بەند و باری دا بەسەر ئەبەن، دین و ڕێی ڕاست تێ‌ئەشکێ، وە نوێژی پێنج کاتە ئەبەسترێ، سەییدە کان سەرگەردان ئەبن، نامەردان لە ڕێی خراپە ئەڕۆن، ستەم و زۆر لە چوار گۆشەی جیهانا پەرە ئەستێنێ، شمشێری ناکەسان بڕنەو تیژ ئەبێ، هەرکەسێ لە ژن و ماڵ و منداڵی خۆی بێزار ئەبێ، زۆربەی خەڵك بە بێ پارێزگاری ژیان ئەبەنە سەر، کوشت و کوشتار لە ئەندازە بەدەر ئەبێ، خوێن وەکوو لافاو بە سنوورە کان تێ‌ئەپەڕێ، زەوی بە تۆپی دوژمن شەق ئەبێ، پەلەوەران لە ترسا بە رووی هەوا ئاوێزان ئەبن، خۆرهەلاّت تا خۆرئاوا لە یەکتر ئاگەدار ئەبن، و پزیسکەی ئاور بەرز ئەبێتەوە، بێ تەل و تەناف بە یەکتر ئەڵێ و خەڵك هەواڵی یەکتر ئەزانن، ئەسپی ئاسنی خەڵك ئەگەیێنێتە شوێنی خۆی، تۆپەکان لە هەوا ئەڕازێنەوە، کەشتی‌یەکانی شەڕ ریز ئەبن، هەتاو و مانگ هەر دوو تاریك ئەبن، لە ساڵی مارا شاحەیدەر ئەقیژێنێ، لەو دەمەدا کوشت و کوشتار زۆر ئەبێ، خەڵك بە پێشەواکان پەنا ئەبەن، ئەوسا پیاوێك ئەبێتە سەرۆکی خەڵك، و بە فەرمانی خوا فەرمانبەرداری ئەکا، ئەو لە شاری مەدینەدا خاوەنی فەڕ و شکۆ ئەبێ، و بە فەرمانی خوا خەڵك ڕێنوێنی ئەکا، سین و ئەلف و لام (سام) ناوی ئەوە، دەشت و دەریا بەکامی ئەو ئەبێ، لە شمشێرەکەی پزیسکی ئاور هەڵئەسێ، و بە ئارەزووی خۆی بێ بڕوایان ئەکوژێ، و دەشت و کێو ئەخاتەگەڕان، ئەوەندە کوشتار ئەکاکە لاشە ئەکەوێتە سەر لاشە، هاوار و قیژە لە شاری زەنگان هەڵئەسێ، دووڕووکان پەشیمان ئەبن، حەوت تەن دیسانەوە سەر هەڵئەدەن، و لە سوڵتانیە خەڵك ئەکەونە ناو پرس و جۆ، تەواوی نەتەوەکان ئەبنە خاوەنی یەك دین، یەك ڕەوشت و یەك ئایینیان ئەبێ، بانگی شاخوەشین ئەگاتەگوێ، و پەیمانی پیاوان لە نوێ تازە ئەبێتەوە، لە ساڵی هەزار وشەست و هەندێ ساڵی مار دێ، شاحەیدەر بە زولفەقار دێ، هانا هانایە لە هەر لاوە بەرز ئەبێتەوە، گەڕانەوەی خەڵك بە خراپە و گرفتار ئەبێ، زوانەی شمشێری پڕپزیسك ئەبێ، وە لە ساتێکاکوشتاری خەڵك سەد هەزار کەس ئەبێ، قیژەی شاحەیدەر و شەقەی زولفەقار، لە هەر لا دێ و هەر دەمێ چەند هەزار، دەنگی هەی هانا لەناو خەڵکەوە هەڵئەسێ، وە ئەوان زولفەقار ماچ

ئەکەنەوە، تەواوی بێگانەکان بڕوا دێنن، گچکە و گەورە شایەتیمان دێنن، تەواوی کێوی‌یەکانی دەشت و دەریا، وستەمکار و ستەم لێ کراو هەموو کڕنۆش ئەکەن، سەرۆکم ئەچێتە سەر تەخت و دائەنیشێ، و بە سام ئەکەوێتە لێ‌پرسینی خەڵک، ئەو شای دوڵدوڵ سوارە بەفەڕ و شکۆوە، بۆ داد پرسینی خەڵک وت و وێژ ئەکا، سرۆش بە ناوی نوێنگەی پیر بنیامین دێت، میکاییل نوێنگەی پیر مووسی‌یە، ئیسرافیل نوینگەی داوودە و شاخنە فیری لە دەمایە، عزرائیل نوێنگەی مستەفایە و بۆ گرتنی گیانی خەڵک ئامادە ئەبێ، ئەو ساکە کاتی لێ پرسینەوەیە، خەڵک لاڵ و بێ‌زمان ئەبن، لە سام ئەپرسن کە لە شا چ هەواڵێکت هەیە، بە میری هەرە بەرز ئەڵێ، مستەفا خاوەن تیر وکەمانە و لە لایەن خواوە راسپێرراوە، هەرکەسێ پاکە نیشانەی هەیە، ئیتر کەسێک تانە لە ئەو نادا، ئەو لێ‌هاتووە و ئەتوانێ لە لای شا دانیشێ، لە لای شای هەرە بەرز روو سپی‌یە، لە دنیا دینار و درەمی ناڕەوا دوورە، کەوابوو هەنگاو هەڵگرە بە ناوی خوا، وە بە دەستی بنیامین خواردنەوە بخۆ، هەرکەسێک حەز لە دنیا بکا پارێزگار نیە، لە لای شاش شەرمەزار ئەبێ، چونکە بۆ لەشی مردوو رۆژی پەسڵانی لە ناو ئەبا، و لە پرسینەوەی رۆژی پەسڵان ئازاد نابێ، رەنگ زەرد و کز و سەر شۆڕ ئەبێ، روو رەش و شەرمەزار ئەبێ، ماوەیێک لەو دەمەدا جیهان پاک ئەکاتەوە، و دەوڵەت ئەداتە خوان و سفرەی پادشاکان، جیهان سەر لە نوێ پایەدار ئەبێ، داد و دادگەری لە دەشت و دەریا پەرە ئەستێنێ، ئەی یاران سەر هەڵدانی خاوەن زولفەقار، بە پێی نامیلکە و نووسراوە لەم دەمەدا ئەبێ، قسەی (خان‌ئەڵماس) بەم جۆرە وترا، سەر هەڵدانی شا بەم جۆرە ئاشکرا ئەبێ.

*****

## ناونامە

ئەو ناوانەی نایانناسی، لێرەدا چاویان بۆ بگێڕە.

**پیر بنیامین:** یەکێ لە یارانی سان سەهاکی بەرزنجەیی‌یەکە لە سەدەی هەشتەمی کۆچی‌دا ژیاوە. لە پەڕاوی (برهان الحق)دا هاتووەکە پیر بنیام یا پیر بنیامین ناز ناوی (سەید خدری شاهۆی)یە. لە بەرگی دووهەمی (مێژووی مەردووخ)دا هاتووە کە مەبەست لە پیر خدری شاهۆ، سید محمد (زهیرالدین) کوڕی سەید مەحموودی مەدەنی‌یەکە گۆڕەکەی لە قوتاق‌ئاوای سنەدایە. لە پیر بنیامینەوە گەلێ هۆنراو بە زاراوەی گۆرانی بەجێ ماوەکە لە پەڕتووکی سەرئەنجامدا تۆمارکراوە.

ئەم دوو هۆنراوە هی ئەوەکە ئەڵێ:

**وەبـــان چـــەمان، وەبـان چـەمان**

**ئـــازیز ئـــەمر تـۆ وەبـان چـەمان**

**هەرچە فەرمای تۆن قەبووڵەن وەگیان**

**مـــەیۆم وەر ویـرها زێـڵم وەشـیان**

**پیر داوود:** یەکێ لە یارانی سان سەهاکی بەرزنجی یەکە لە سەدەی هەشتەمی کۆچی‌دا ژیاوە. لە پەڕاوی (برهان الحق) دا هاتووەکە پیر داوود بە ناوی (داوودی کەووسوار) ناسراوە، لە ئازایی و نەبەزی‌دا بێ‌وێنە بووە. لە پیر داوودیشەوە گەلێ هۆنراو بە زاروەی گۆرانی بە جێ ماوەکە گەلێ پاراو و شیرینن. ئەم دوو هۆنراوە هی ئەوەکە ئەڵێ:

**نە یانەی سڕ بێ، نە یـانەی سـڕ بـێ**

**بـنیام زێـدەوان نـە یـانەی سـڕ بـێ**

**جە باڵای سەنگ‌دا ئەو دەریا پڕ بێ**

**هەفت لەوح ئەو سڕ جیا نە دوڕ بێ**

**پیرمووسی:** یەکێ لە یاران و نووسەرانی تایبەتی سان سەهاکی بەرزنجی‌یەکە لە سەدەی هەشتەمی کۆچی‌دا ژیاوە. لە پەڕاوی (برهان الحق)دا هاتووەکە پیر مووسی نازناوی (ملا رکن الدین الدمشقی)یە و گۆڕەکەی لە شاری کرندی ئوستانی کرماشان دایەکە خەڵک هەموو دەمێ دیتنی لێوە ئەکەن. لە پیر مووسی‌یەوە گەلێ هۆنراو بە

زاراوەی گۆرانی بەجێ ماوە کە گەلێ پاراو و دڵگرن. ئەم دوو هۆنراوە هی ئەوە کە ئەڵێ:

**نە حەڵاڵ زیاتر مەکەردی حەرام**
**وەرنە حەڵاڵی جفتان مەبۆ ڕام**
**ژیتان مەگنۆ وە نوتفەی ناکام**
**هامسەریتان مەو باتڵ و بەد نام**

**حەلەب:** یەکێ لە شارەکانی سووریایە کە بە یەکێ لە شارە کۆنەکانی دنیا ئەژمێررێ. ناوی ئەم شارە لە بەردە نووسراوەکاندا بە ناوی (بیرۆی) هاتووە. ئیرانییەکان ئەم شارەیانە لە ساڵی ٥٤٠ی زایندا خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، لە سەردەمی ئیسلامەتیدا بە هۆی (ابوعبیدةبن الجراح)ەوە داگیر کرا. (سیف‌الدولەی حەمدانی) ئەم شارەی کردە پایتەختی خۆی، پاشان مەغوولەکان هێرشیان هێنایە سەر ئەم شارە و گەلێ لە خەڵکەکەیان کوشت و بوونە هۆی کاولی و وێرانی شارەکە و پاشان کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان، ئەم شارە هەر لە کۆنەوە جێی پەرەدانی زانست و وێژەی ئیسلامی بووە و گەلێ هۆزان و هۆنەر و نووسەری لێ هەڵکەوتووە.

**خان ئاتەش:** کوڕی موحەممەد بەگ و برای خان ئەڵماسە کە لە سەدەی یانزەهەمی کۆچی دا ژیاوە و لە لوڕستاندا کۆچی دوایی کردووە.

لە (برهان‌الحق)دا هاتووە کە خان ئاتەش لە پاش مردنی باوکی بووەتە جێ‌نشینی و خەریکی ڕێنموونی خەڵک بووە و خەڵکی بۆ ڕێی چاکە و خواپەرستی هان داوە و گەلێ شوێنەواری ئاوەدانی لە خۆیەوە بەجێ هێشتووە.

**شاخوەشین:** یەکێ لە رابەران و پیاوە گەورەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچییەکە ناوی مبارەک شاو کوڕی جەلالەخاتوونی لوڕستانییە. لە (سەرئەنجام)ێکی دەست نووس دا هاتووە کە (شا خوەشین) ٣٦٦ ساڵ پاش هافی عەلی لە دایک بووە، لەبەر ئەوەی هافی عەلی لە ساڵی ٤٠ی کۆچیدا کوژراوە، سەرهەڵدانی شا خوەشین لە ساڵی ٤٠٦ی کۆچیدا رووی داوە و لە یادداشتەکانی (کاکاردایی)یش دا نووسراوە کە شاخوەشین لە لوڕستاندا لە دایک بووە و هەر لەوێش پێ گەیشتووە و پاشان چووەتە هەمەدان و لە لای زانایانی ئەو شارە فێری زانست بووە و گەڕاوەتەوە

لورِستان و ژیانی بە رێنموونی خەڵك بردووەتە سەر تا لە ٣٢ ساڵی لە رووباری گاماسپ‌دا نوقم بووە رووباری گاماسپ لە نزیکی شاری هەرسین دایە. کەوا بوو شاخوەشین لە ساڵی ٤٠٦ تا ٤٦٧ی کۆچی‌دا ژیاوە. لە شاخوەشین و یارانیەوە گەلێ دوو بەیتی بە زاراوەی گۆرانی بە جێ ماوە کە بە ناوی (دەورەی شاخوەشین) ناسراوە، ئەم دوو بەیتی‌یە هی ئەوە کە ئەڵێ:

**مامام جەلالە، کاکام، رەنگینە**

**دوون وە دوون ئامام چینە وە چینە**

**ها ئیسا یوورت و نامم خوەشینە**

**هەر کەس بشناسۆم پاکش مەوکینە**

**شام:** یەکێ لە شارە کۆنەکانی جیهانە و مێژووی ئەگەڕێتەوە بۆ پێنج هەزار ساڵ لەمەوپێش، ئاشووری‌یەکان و بابلی‌یەکان و ئێرانی‌یەکان و یوونانی‌یەکان و رۆمی‌یەکان پەلاماریان هێناوەتە سەر دانیشتوانی شارەکە و داگیریان کردووە. لە سەردەمی ئیسلامەتی‌دا ئەم شارە گیراوە و ئەمەوی‌یەکان کردیانە پایتەختی خۆیان و گەلێ شوێنەواریان لێ بەجێ ماوە تەیمووری لەنگ لە پەلامارەکەیا ئەم شارەی سووتاندووە و پاشان کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی‌یەکانەوە.

سەلاح‌الدینی ئەیووبی رۆڵەی نەمری کورد لەم شارەدا نێژراوە. ئەم شارە ئێستە پایتەختی سووریایە و (دمشق)ی پێ ئەڵێن.

**قەزوێن:** یەکێ لە شارە کۆنەکانی ئێرانە کە بە پێی بەڵگەی مێژوو نووسان ئەم شارە لە زەمانی شاپووری یەکەمی ساسانی (٢٤١ - ٢٧٢ی زایین)دا ئاوا بووەتەوە. ئەم شارە لە رۆژگاری ئیسلامەتی‌دا گەلێ ئاوا بووە و دەیلەمەکان و مەغوولەکان چەندین جار پەلاماریان هێناوەتە سەر دانیشتوانی ئەم شارە و شوێنەوارە مێژوویی‌یەکانیان بە تەواوی کاول کردووە. شا تامازی یەکەم لە ساڵی ٩٦٤ی کۆچی‌دا ئەم شارەی کردووەتە پایتەختی خۆی. لە زەمانی شا عەباسی یەکەم (٩٩٦ - ١٠٣٨ی کۆچی)دا سان حوسەین لە پاش سەرکوت کردنی ئەفغانەکان هێرشی بردووەتە قەزوێن و گەلێ زیانی بە دانیشتوانی شارەکە گەیاندووە. شاری قەزوێن ئێستا گەلێ ئاوایە و بە یەکێ لە شارە گرنگەکانی ئێران دێتە ئەژمار.

# پێش بینی یەکانی
## دەروێش وەجاخ گاوارەیی

کۆکردنەوە و ئامادە کردنی: د. سدێق بۆرەکەیی



وێنەی خەیاڵی دەروێش وەجاخ کە بە قەڵەمی هونەرمەند کاک هادی زیائەدینی کێشراوە

# پێشەکی

نامیلکەیی کە بە ناوی پێش‌بینی‌یەکانی دەروێش وەجاخ ناسراوە، داگری کۆمەڵێک رووداوە سەبارەت بە ئاینده و داهاتووی نەتەوەی کورد کە شاخوەشینی لوڕستانی (٤٠٦ - ٤٦٧ی کۆچی) ئەو رووداوانەی پێش بینی‌کردووە و دەروێش وەجاخیش بە هۆنراوە هۆنیویەتەوە.

ئەم رووداوانە هەر کام لە رۆژگارێکی دیاری کراودا روو ئەدا و دێوان یا دوژمنانی کورد کە ئیمپریالیزمە لە هەر لاوە هێرشیان هێناوەتە سەر وڵاتەکەمان و هەموو شتێکیان سووتاندوە و تەنانەت شارە گەورەکانیان وێران کردووە و زۆربەی هۆزەکانی کوردیان لە ناو بردووە، ئەم بارە نە تەنیا هەر بۆ خەڵک بەڵکوو بۆ جانەوەرەکان و گیا و رووەکەکانیش هاتووەتە دی و لە زەوی و ئاسمان دووکەڵ خانەکانی سووتاو بڵاو ئەبێتەوە و پاشان برسیەتی و هەژاری و تولانەوە لە وڵاتەکەمان‌دا پەرە ئەستێنێ و رێ و رەوشتی دین لەبەر چاو ناگیرێ و باکانی سارد و گەرم هەڵئەکا و باران کەمتر ئەبارێ و ئەهریمەن بە سەر وڵاتەکەمان دا زاڵ ئەبێ.

ئەهریمەن هەر بە وڵاتەکەمان دانەساکا و پێڕەوانی خۆی نارده وڵاتەکانی تریش تا داوی خۆی لە هەموو شوێنێکی جیهان دا بتەنێتەوە و ئەوانیش بخاتە داو و هەموو شتێ لە ناو ببا و رەگەزی دێوان و ئەهریمەنەکان بە یارمەتی هاوڕێکانیان بە زۆربەی وڵاتەکان رێ پەیدا ئەکەن و هەموو شتێک داگیر ئەکەن و دەست ئەکەنە زۆر و ستەم و پیرۆزی و سەرکەوتنی خۆیان بە خەڵک رائەگەیێنن.

بەڵام لەبەر ئەوەی پیرۆزی هەموو دەم هەر بە دەستی پەیڕەوانی هۆرمزە، بۆیە درگای هیوا بۆ هەموو کەسێک ئەکرێتەوە و ئیتر ئەهریمەن ناتوانێ راوەستێ و خەڵک یەک ئەگرن و ئەکەونە بەربەرەکانێ و بەم جۆرە گەلێک لە مەڵبەندەکان ئازاد ئەبێ و

خەڵک خەریکی ئاوەدانی و کشت و کاڵ ئەبن، بەڵام کاری ئەهریمەن لەبەر ئەوەی شەڕ و کوشتار و وێران کردنە، بۆیە شەڕێک لە وڵاتەکەمان دروست ئەکا و وەلێ بە هۆی بەرپرسان ئەم پیلانە لە ناو ئەچێ و خەڵک دەست ئەکەنە پیراز کردن و ئاوەدان کردنەوەی مەڵبەندەکان.

ئەم پێش‌بینی‌یانە هەر کام لە رۆژگارێکی دیاری کراودا رووی داوە و لە راستەقینەدا لە رێی خواناسی‌یەوە سەرچاوەی گرتووە و لە ئایینی زەردەشتیش‌دا پێش‌بینی هەیە و بەشێک لە پەرتووکی دینکەرد و بوندهشن و زەردەشت نامە و جاماسپ نامە پێش‌بینی‌یەکە لە وانەدا سەبارەت بە داهاتووی ئێران باس کراوە.

لە گەلێ لە پەرتووکەکانی ئیسلامیش دا وەکوو: بحارالانوار، مظاهرالانوار، حلیةالمتقین، نجم الثاقب، تبصرة العوام گەلێ پێشگۆیی لە بارەی داهاتووی جیهان کراوە کە زۆربەی ئەوانەیان لە زمانی پێغەمبەری گەورەی ئیسلام گێڕاوەتەوە و لە ئایینی جوولەکە و فەلەش‌دا پێش‌بینی‌هەیە.

لە راستەقینەدا ئەستێرەناسی و پێش‌گۆیی لە سەرەتای ژیار و شارستانیەتی مرۆوە هاتووەتە دی چونکە مرۆی ناکام هەر لە دەوری کۆنەوە تێ ئەکۆشا کە لە تەنگ و چەڵمەکانی ژیان خۆی رزگار کا و داهاتوویێکی روون بۆ خۆی تەرخان بکا.

پێشگۆیی و ئەستێرە ناسی لە ئورووپاش‌دا باو بووە و خەڵک بۆ پێشگۆکان رێزیان دائەنا بەڵام قەشەکان هەموو دەم لە گەڵ ئەوان دا بەشەڕ ئەهاتن. نوسترادامووس (١٥٠٣ - ١٥٦٥ی زایین) کە یەکێ لە پێشگۆکانی ناسراوی دەرباری کاترین دومدیسی و شارلی نۆهەم پادشای فەرەنسە بوو، پێش‌بینی‌یەکانی ئەویان دەم بە دەم ئەیانگێڕاوە و گەلێ پێشگۆی تریش هەبوو کە خەڵک زۆر رێزیان بۆیان دائەنا.

لە ناو یارسانەکان یا کاکەیی‌یەکانیش‌دا گەلێ پێشگۆ سەریان هەڵداوە کە لە ناو ئەوانەدا ئەتوانین لە عێل‌بەگی جاف (٨٩٨ - ٩٦١ی کۆچی)، خان ئەڵماسی

لوڕستانی (۱۰۷۲ - ۱۱۳۸ی کۆچی)، و دەروێش وەجاخی گاوارەیی ناو بەین.

دەروێش وەجاخ کوڕی فەرهاد میرزای گاوارەیی لە ساڵی ۱۲۲۱ی کۆچی لە دێی گاوارەی سەر بە کرماشان دا لە دایک بووە و هەر لە منداڵی‌یەوە خەریکی خوێندن بووە و لە دەساڵاندا قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە و پاشان ریشۆنی و رەوان بێژی خوێندووە و ئەوسا چووەتە لای سەی براکە (۱۲۱۰ - ۱۲۹۰ی کۆچی) و ماوەیێک لە لای ئەو خوێندوویەتی و لە پاشا گەڕاوەتەوە زێدەکەی خۆی و خەریکی کشت و کاڵ و ڕێنوێنی خەڵک بووە تا لە ساڵی ۱۲۸۶ی کۆچی داکۆچی دوایی کردووە.

دەروێش وەجاخ هۆنەرێکی هەرە بەرز بووە و زۆربەی هۆنراوەکانی بە زاراوەی گۆرانی هۆنیوەتەوە و پێش‌بینی‌یەکانی ئەو لە ناو خەڵک‌دا باوە و زۆربەی ئەو پێش‌بینی‌یانە سەبارەت بە داهاتووی ئێران و جیهانە.

لە پێش‌بینی‌یەکانی دەروێش وەجاخ هەر تەنیا نوسخەیێکم دەست کەوت کە لە ساڵی ۱۲۹۲ی کۆچی دا بە هۆی بارامی قورکەیی‌یەوە لە دێی گاوارە دا نووسراوەتەوە کە ئەوا لێرەدا هۆنراوەکانی شی ئەکەینەوە و پێشکەشتانی ئەکەین

تاران - مانگی خەرمانان ۱۳۸۱

د. صدێق بۆرەکەیی

## (١)

رەســـــتاخێز مـــەبۆ، رەســـــتاخێز مـــەبۆ
یـــــاران بـــزانـــان رەســـــتاخێز مـــەبۆ
نـە ئـووروس جـەنگ و شـەڕ بـەرپا مـەبۆ
لاشـــەی جـووانـان نـەیەک جـیا مـەبۆ
جـەنگێ‌تر نـەو جـا وە هـوون پـڕ مـەبۆ
کـارگەر و وەرزیـار یـەکسـەر قـڕ مـەبۆ
دنـــیا نـــەو ســـاتە هـــەر وەقـاڵ مـەبۆ
فـــرێ جـــە مـــەردوم جـا پـاماڵ مـەبۆ
جـــەنگ شـێر و گـۆڕ هـەر پـەیدا مـەبۆ
فـــرێ چشت هـــەن هـــووەیدا مـــەبۆ

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێتە دی، لە وڵاتی رووس‌دا شەڕ و هەرا بەرپا ئەبێ، و لاشەی جوانەکان لە یەک جیا ئەبێتەوە، لە وێدا شەڕێ‌تر پەیدا ئەبێ کە گەلێ خوێنی تیا ئەڕژێ، وکرێکار و وەرزێر بە جارێ قڕ ئەبێ، جیهان لەو ساتەدا پڕ لە غەوغا ئەبێ، گەلێ لە خەڵک پێ‌شێل ئەبێ، شەڕی شێر و گۆڕ هەر پەیدا ئەبێ، گەلێ شت هەیە کە ئاشکرا ئەبێ.

### لێک دانەوەی هۆنراوەکان

دەروێش وەجاخ لەم پارچە هـەڵبەستەدا دیـاردی ئـەکـاتە شـۆڕشی رووس و یەکشەمەی خوێنین کە یەکێ لە رووداوەکانی سەدەی بیستەمە و لە بەدی هاتنی ئەم شۆڕشەدا کە لە ساڵی ١٩١٧ی زایین بەرانـبەر بـە ١٢٩٦ی هـەتاوی دا رووی دا،

تاقمێک لە کمونیستە کانی رووس توانیان بە رێبەرایەتی ولادیمیر ئیلیچ ئولیانۆف کە نازناوی لینین بوو هێز بگرنە دەست و بە لە ناو بردنی دوژمنانی خۆیان رژیمی تزاری لە ناو ببەن و دەوڵەتی کومونیستی بهێننە دی. هۆی ئەم شۆڕشەش شکستی رووس لە ژاپون لە ساڵی ۱۹۰۵دا بوو کە بەم هۆیە هێزی تزار بە جارێ کز بوو، وە هۆی دووەم کوشتاری کرێکاران و وەرزێران بوو کە لە رۆژی یە کشەمەی ساڵی ۱۹۰۵دا بۆ چاک کردنەوەی باری خۆیان خۆپیشاندانێکی ئارامیان دەست پێ کرد و لە ئاکامدا دەوڵەتی تزار کوشتارێکی لەوان کرد و لە پاشا مانگرتن و نائارامی لە شارە کانی گەورەی رووسدا دەستی پێ کرد و نارەزامەندی خەڵک پتر بوو تا ئەوەی تزار ناچار بوو کە لە پادشایی دەست هەڵگرێ.

*****

(۲)

رەســــتاخێز مــــەبۆ، رەســــتاخێز مــــەبۆ
یــــاران بــــزانــــان رەســــتاخێز مــــەبۆ
زولفــەقار نــە فــەرق حــەجەر تــێز مــەبۆ
نــە ئــەرزول بەحرەین ولگــەرێز مــەبۆ
هــــژمەت بــــاتن بــــینای شــــەڕ مــــەبۆ
تــــەلاتوم قــــین بــــەحر و بــــەڕ مــــەبۆ
عــــاڵەم مــــوسەخخەر تــــار و مــــار مــەبۆ
نــــیشانەی ئــــاخێز نــــە بــــەهار مــــەبۆ
عــــوسمانی ئــــانە زەدەی جــــەنگ مــەبۆ
ئــــەسیر و عــــەبید گــــرد فــەرەنگ مــەبۆ

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێتە دی، زولفەقار

(شمشێرەکەی هافی عەلی) بۆ کوشتاری گاوران تیژ ئەبێ، لە سەر زەوی بەحرەیندا گەلاڕێزان ئەبێ، رقی دەروون ئەبێتە هۆی شەڕ و هەرا، خرۆشی رق و قین دەریا و وشکی دائەپۆشێنێ، جیهان ئەکەوێتە بەر تەم و تاریکی، و نیشانەی راپەڕین و هەستان لە بەهاردا دەر ئەکەوێ، ولاتی عوسمانی بە جارێ تووشی شەڕ و هەرا ئەبێ، و هەموو دیلی فەرەنگ ئەبن،

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

دیاردی‌یە بۆ لە ناوچوونی دەوڵەتی عوسمانی و بەش بەش بوونی خاکی عوسمانی لە نێوان ولاتەکانی ئینگلستان و فەرەنسە کە ئەم رووداوە لە ساڵی ١٩١٦ بە پێی پەیمانی سایکس پیکۆ هاتە دی و بە پێی ئەم پەیمانە عێراق و ئوردەن و فەلەستین کەوتە ژێر رکێفی ئینگلستان و سووریە و لوبنانیش کەوتە ژێر دەسەلاتی فەرەنسە و لەم کاتەدا شەریف حوسەین فەرمانڕەوای مەکە کە ئارەزووی داگیر کردنی ولاتەکانی ئیسلامی لە سەردا بوو ئامادە بوو بۆ گەیشتن بە هیوای خۆی لە گەڵ ئینگلیزەکان دا هاوکاری بکا و خۆی و کوڕەکانی لە گەڵ لۆرنس‌دا توانیان عەرەبەکان راپەڕێنن، بەلام شەریف حوسەین بە هیوای خۆی نەگەیشت و ئینگلیزەکان ئەویان بە سوودی خەنیمەکەی عەبدولعەزیزی سێیەم کوڕی سوعوود کە لە نەجدی عەرەبستاندا فەرمانڕەوایی ئەکرد تەنیا هێشت و بە هۆی ئەو خزمەتانەی کە بە ئینگلیزەکان کردبووی یەکێ لە کوڕەکانیان بە ناوی فەیسەڵ کردە پاشای عێراق و کوڕەکەی تریان عەبدوللا کردە پادشای ئوردەن و ئیتر عێراق و ئوردەن تا ماوەیێک لە ژێر رکێفی ئەوانا بوو.

*****

## (٣)

رەسـتاخێز مـەبۆ، رەسـتاخێز مـەبۆ
یـاران بـزانـان رەسـتاخێز مـەبۆ
حـیجاز و عـێراق گشت ئـەسیر مـەبۆ
وە دەست فـەرەنگ وە زەنـجیر مـەبۆ
فـەڵەستین وە دەست یـەهوودگیر مـەبۆ
مـوسڵمان خـاس هـەر زویـر مـەبۆ
هـەر یـەک جـە زێـدش تـار و مـار مەبۆ
زیـندەگـی پـەرێش ژار مـار مـەبۆ
فـەرەنگ جـەو کـاتە وە سـەروەر مـەبۆ
مـوسڵمان جـە ژیـن هـەر بـێوەر مـەبۆ

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێتە دی، خەڵکی حیجاز و عێراق هەموویان بە دیل ئەگیررێن، و بە دەستی فەرەنگەکان بە زنجیر ئەکێشرێن، فەڵەستین بە هۆی جوولەکەکان داگیر ئەکرێ، و موسڵمانی چاک هەموو دەم خەمبار ئەبێ، و هەر کام لە زێد و مەڵبەندی خۆی تار و مار ئەبێ، و ژیان بۆی وەکوو ژاری مار ئەبێ، فەرەنگەکان لەو دەمەدا ئەبنە سەرۆک، و موسڵمانەکان لە ژین نائومێد و بێبەری ئەبن.

### لێکدانەوەی هۆنراوەکان

دیاردییە بە دەرکـردنی فـەڵەستینییەکـان لە وڵاتـی بـاو و بـاپیریان بـەهۆی

ئینگلیزه کان و بەدی هاتنی دەوڵەتێ بە ناوی ئیسراییل یا جوولە کە، و لە بەر ئەوەی فەڵەستین لە دوای شەڕی جیهانی یە کەم بە پێی بڕیاری نەتەوە یە کگرتووە کان کەوتە دەستی ئینگلیزە کان، سەهیۆنیستە کان لەم وڵاتە ئیسلامی یەداکەوتنە هەوڵ و تێکۆشان و لە ساڵی ۱۹۱۷دا لۆرد بالفۆر وەزیری دەرەوەی ئینگلستان بە هۆی پەیامێک رای‌گەیاند کە جوولە کە کان لە فەڵەستین‌دا ئەتوانن دەوڵەتێ بۆ خۆیان دامەزرێنن و لە پاشا جوولە کە کان لە سەرتاسەری جیهانا کۆچیان کردە فەڵەستین و کاتێ فەڵەستینی یە کان بەمەیان زانی لە بەرابەری ئینگلیزە کان‌دا راپەڕین کە گرنگترین راپەڕینی فەڵەستینی‌یە کان راپەڕینی شێخ عیززەدینی قەسامە کە لە ساڵی ۱۹۳۵دا بە هۆی ئینگلیزە کانەوە سەرکوت کراو پاشان جوولە کە کان گەلێ لە عەرەبە کانیان کوشت و ماڵە کانیان سووتان و ئیتر خەریکی ئەشکەنجە و ئازاری فەڵەستینی‌یە کان بوون و فەڵەستینی‌یە کانیش ناچار وڵاتە کەیان بەجێ هێشت و ئاوارەی هەندەران بوون.

*****

## (۴)

رەسـتاخێز مـەبۆ، رەسـتاخێز مـەبۆ
یـاران بـزانـان رەسـتاخێز مـەبۆ
جـەنگ و کـەشمە کـەش جە گـرد لا مـەبۆ
واران ئـاهر چـون بـەلا مـەبۆ
نـەی کـەشمە کـەشە فـەرەنگ پـیرۆز بۆ
پـیرۆزی ئـەووەڵ پـەرێ گـرد هـۆز بـۆ
جـە یـەک لا مـەرگ و یـەک لا قـاتی بۆ
پـەرێ مـوسڵمان رۆی نـەهاتی بـۆ

دوو سەری دنیا ئەورۆ بەربەر بۆ
خەیلێ جە مەردوم یەک یەک هەر قڕ بۆ

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێتە دی، شەڕ و کێشە و هەرا لە هەر لایێکەوە دەست پێ ئەکا، و بارانی ئاور وەکوو ئاپۆرە و وەی ئەبارێ، لەم قڕە و کێشەدا فەرەنگ سەر ئەکەوێ، پیرۆزی سەرەتا بووە بەشی تەواوی تاقمەکان، لە لایێ مەرگ و لە لایێ تر قاتی و قڕی رووی دا، وە بۆ موسڵمانان رۆژی نەهاتی بوو، دووسەری جیهان لەو رۆژەدا کارێکی ئاسایی بوو، گەلێ لە خەڵک یەک یەک قڕ بوون

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

دیاردی یە بە پیرۆزی هاوپەیمانەکان کە دەوڵەتەکانی تەوەرە بە پێی پەیمانی دژی کۆمینترن بە یەکەوە هاوپەیمان بوون، بەلاّم هیچ کات نەیانتوانی هێزێکی گەورە بەدی بێنن، لە پاشا دەوڵەتەکانی هاوپەیمان بە پێی بڕیاری ئاتلانتیک هێزێکیان لە سەرتاسەری جیهاندا بەدی هێنا و تێ ئەکۆشان کە ولاّتە بێ لایەنەکان بە خۆیان نزیک کەنەوە و هیتلر بۆ نزیک کردنەوەی دەوڵەتەکانی خۆرئاوایی ئامادەیی خۆی دەربڕی و داوای لێیان کرد لە سەرتاسەری جیهاندا ئاشتی بهێننە دی و ئەوسا لە گەڵ کومونیستەکاندا کەوتە شەڕ، پێشڕەوتی هێزەکانی ئەڵمانی لە رووس و باڵکان و نزیک بوونەوەی هێزەکانی ئەڵمانی و ئیتالیایی بە کاناڵی سوئیز، ولاّتە خۆرئاوایی یەکانی خستە سەر ئەوە تا لە گەڵ رووسەکاندا یەک بگرن و چرچیل خۆی ئامادە کرد کە یارمەتی رووسەکان بدا و ئەمریکاشی کردە هاوڕێی خۆی چونکە هیتلر ئەی ویست سەرتاسەری جیهان بگرێ و سەرئەنجام هاوپەیمانەکان لە ساڵی ۱۹۴۱دا ئێرانیان داگیر کرد و بە هۆی رێ ئاسن کۆمەکیان کردە رووسەکان هەتا هیتلێریان تێ شکاند و لە ناویان برد.

*****

## (٥)

رەســـــتاخێز مـــەبۆ، رەســـــتاخێز مــــەبۆ
یـــــاران بـــزانـــان رەســـــتاخێز مــــەبۆ
زوڵـم و زەلاڵـەت بـەرز مـەو نـە شـاران
دنـــیا تـــاریک و تـــار بـۆ پـەی یـاران
جـە بـەندەرێ مـەو سەرباز چەپ و راس
بــەلا نـــازڵ بـــۆ نــە دوو شـار خـاس
ئـــەوراک و ئـــازار مـەیۆ پـەی مـەردوم
مـەردوم جـە دڵـێ دوو گـرد مەون گـوم
ئـەوەند کـوشته بـۆ نـەو هـەرا و هـەڵمە
رووشـــان سـیا بـــۆ بـە وێـنەی شـەڵمە

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێـتە دی، زۆر و ستەم و گومڕایی لە شارەکاندا پەرە ئەستێنێ، و جیهان بۆ یاران تەنگ و تاریک ئەبێ، لە یەکێ لە بەندەرەکانیدا سەربازەکان چەپ و راست دێن، لە دوو شاری جواندا وەی و ئاپوورە دێتە خوار، برسیەتی و نەخۆشی و ئازار بۆ خەڵک پەیدا ئەبێ، و خەڵک لە ناو دووکەڵی شەڕا ون ئەبن، ئەوەندە خەڵک لەو هـەرا و هـەڵمە ئـە کـوژرێ، کـە روومەتی خەڵک وەکوو خەڵووز رەش ئەبێ.

### لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئاماژەیە بۆ بۆمباردومانی ئەتومی هیرۆشیما و ناکازاکی کە ئەو دوو شـارە لە کەناری دەریا دان، وڵاتی ژاپون لەبەر ئەوەی لە گەڵ هاوپەیماناندا شەڕی ئەکرد،

هاوپەیمانەکان لە ساڵی ١٩٤٥دا داوایان کرد کە ژاپۆن بە بێ مەرج خۆی بداتە دەستەوە بەڵام ژاپون قبوولی نەکرد و سەرئەنجام هەر لەو ساڵەدا هیرۆشیما بە هۆی ئەمریکایی‌یەکان بە بۆمبای ئەتۆمی بۆمباران کرا و سەد و شەست هەزار کەس گیانی خۆیانیان لە دەست دا و پاشان ئەمریکایی‌یەکان بۆ دووهەمین جار بە بۆمبای ئەتۆمی شاری ناکازاکیان بۆمباردومان کرد و لەوەدا هەزاران کەسیان کوشت و ئەوسا دەوڵەتی ژاپۆن لە ترسا خۆی دا بە دەستەوە و لە دوای شەڕەکە نەخۆشی چاو قووڵکە و برسیەتی لە ناو خەڵکدا پەرەی سەند و گەلێ خەڵک کە زیندوو مابوون بە هۆی نەخۆشی و برسیەتی‌یەوە مردن و نەخۆشەکان بە هۆی نەخۆشی‌یەکەیان ڕوومەتیان ڕەش هەڵگەڕا بوو.

*****

(٦)

ڕەستاخێز مەبۆ، ڕەستاخێز مەبۆ
یاران بزانان ڕەستاخێز مەبۆ
ئەو ڕۆژە پەرێ گردمان نەهات بۆ
کوشت و کوشتار و دام و نەهات بۆ
جەنگ و هەنگامە نە سەربسات بۆ
یاران ئەو ڕۆژە هەر ڕۆی مەمات بۆ
رووس و فەرەنگ بۆ وێنەی خەشارێ
دیوارێ مەنن نە دەور شارێ
عالەم موسەخخەر زەدەی جەنگ مەبۆ
ئەسیر هەلای گرد فەرەنگ مەبۆ

واتە: ڕاپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن ڕاپەڕین دێتە دی، ئەو ڕۆژە بۆ

هەموومان شووم و نەهات بوو، کوشت و کوشتار و داو بۆ هەموو کەسێک دێتە دی، شەڕ و هەنگامە لە جیهاندا دەست پێ ئەکا، ئەی یاران ئەو رۆژە هەر رۆژی مەرگە، رووس و فەرەنگ گەلێ پەست ئەبن، دیوارێک لە دەوری شارێکدا دائەنن، جیهان داگیر ئەکەن و شەڕ و شۆڕی تیا هەڵئەگیرسێنن، وە خەڵک دیلی فەرەنگەکان ئەبێ

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئاماژەیە بۆ دروست کردنی دیواری بەرلین کە دەوڵەتی ئەڵمانی خۆرهەڵاتی ئەو دەمە لە ژێر دەسەڵاتی رووسەکاندا بوو بۆ ئەوەی بەری هات و چۆی خەڵکی ئەڵمانی خۆرئاوایی بگرێ دەستی کردە درووست کردنی دیوارێ لە نیوانی دوو نیوەی خۆر هەڵاتی و خۆر ئاوایی شاری بەرلیندا و ئەو دیواریە بە سیمی دڕکاوی و پاسەوانی هەمیشەیی ئامادە کرد و دروست بوونی ئەو دیوارە بووە هۆی ئاوارە بوونی گەلێ لە بنەماڵەکانی ئەڵمانی و نێوانیان لە یەک پچڕا و ئەم دیوارە غەوغاییێکی لە دنیادا هەڵسان و ئەوەش ئەبێ بڵێین کە بەر لە درووست بوونی ئەو دیوارە دەوڵەتەکانی خۆر ئاوایی، ئەڵمانی خۆر ئاوایییان لە ساڵی ١٩٥٥ دا بە ئەندامی ناتۆ دەر هێنا و رووسیش ئەڵمانی خۆر هەڵاتی بە پەیمانی وەرشۆ دەرهێنا و بەم جۆرە هەر کام خەڵکی ئەڵمانیان بە زۆر راگرت بە بێ ئەوەی ئەڵمانییەکان بتوانن بیر و رای خۆیان دەرببڕن و چارەیێک بدۆزنەوە.

*****

(٧)

رەسـتاخێز مـەبۆ، رەسـتاخێز مـەبۆ
یـاران بـزانـان رەسـتاخێز مـەبۆ
یـاران مـەو وەقـاڵ، یـاران مـەو وە قـاڵ
ئـی داوای داوە ئـاخر مـەو وە قـاڵ

یــەک وایـــێ مــەیۆ یــانێ کــە شــەماڵ
بـــێ بـــاڵ و بـــاڵدار هـــەر دوو مـــەدۆ بـــاڵ
ســـــەرداریێ مـــــەیۆ شـــــا نگـــوون کـــەرۆ
گـــــرد ســـــتەمکاران ئـــەو زەبـــوون کـــەرۆ
«ئـــوجاغ» شـــــەماڵە تـــیژ دەو و تـــاوەن
پـــــــەی رۆژ بــــاقی یـــــارم حـــــەساوەن

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران شەڕ و هەرا و هەنگامە بەرپا ئەبێ، سەرئەنجام شەڕ و هەرا لە وڵاتدا روو ئەدا، بایێ وەکوو بای شەماڵ هەڵئەکا، بێ باڵ و باڵدار هەر دوو ئەکەونە فڕین، لەم کاتەدا سەرۆ کێک دێ و شا لە ناو ئەبا، هەموو ستەمکارەکان زار و زەبوون ئەکا، «وەجاخ» ئەم بایە، بایێکی توند و تیژە وەکوو شەماڵ، و لە رۆژی دوایی‌دا هەر یارم بە فریامانا ئەگا.

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئاماژەیە بە راپەڕینی سەتارخان سەرۆکی نەتەوایەتی ئێران کە خەڵکی بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ حەمە عەلی شای قاجاردا هان دا و ئەو لە شاری تەورێزدا خەڵکی‌راپەڕاند و ئەوان بە یارمەتی سەتارخان تارانیان داگیرکرد و لە ساڵی ١٣٢٧ی کۆچی دا شەڕکەران گەیشتنە شاری تاران و حەمە عەلی شایان لە سەر تەخت لابرد و ستەمکارانیان گەیاندە سزای خۆیان و دەوڵەتێ سەربەخۆیان بەدی هێنا و بەم جۆرە باری کۆمەڵایەتی گۆڕا و داد و دادگەری لە وڵاتدا هاتە دی و سەتارخان لە دوای گرتنی تاران بە ڕێزێکی زۆرەوە گەیشتە پێتەخت و سەرئەنجام لە ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی لە چل و پێنج ساڵی‌دا لە تاران کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیان بردە ناوچەی عەبدولعەزیم و لەوێ‌دا ناشتیان.

*****

## (٨)

رەســــتاخێز مـــەبۆ، رەســــتاخێز مـــەبۆ
یـــــاران بـــزانـــان رەســــتاخێز مـــەبۆ
یـــەکـــێ پـــەیدا مـــەوجـــە ئـــی رۆزگـــار
مـــەردوم مـــەکـــەرۆ ئـــەو زار و زگـــار
ژنـــــان، کـــناچان ســـەرپەتی کـــەرۆ
گـــردین جـــووانـــان وە بـــێ رابـــەرۆ
ئـــێران بـــە وێـــنەی شـــار فـــەرەنگ کـــەرۆ
هـــەرجـــا مـــەوێنی رەنگـــارەنگ کـــەرۆ
ئـــەمما ئـــەو چـــەنی مـــەردوم جـــەنگش بـۆ
کـــارش ئـــینە بـــۆ، ئـــینە رەنگش بـــۆ

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپـەڕین دێـتە دی، یـەکـێک لەم ڕۆژگارەدا پەیدا ئەبێ، کە خەڵک بە جارێ زار و زگار و زەبوون ئەکا، ژنەکان و کچەکان سەرپەتی ئەکا، هەمووی لاوەکان ئەخاتە بێ ڕێیە، ئێران وەکوو شاری فەرەنگ ئەڕازێنێتەوە، هەرجێ کە ئەبینی رەنگارەنگ و جوانە، بەڵام ئەو پاشان لە گەڵ خەڵک دا بەشەڕ دێ، ئەوکاری ئەمەیە و ڕێ و رەوشتی ئەمەیە.

### لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئاماژەیە بۆ هاتنە سەرکاری رەزاخانی پەهلەوی کە لە دوای بەدی هاتنی نەریتی مەشرووتە و هەڵاتنی حەمە عەلی شای قاجار، دەوڵەتەکانی فەرەنگ بڕیاریان‌داکە بە هەر جۆرێک بووە دەسەڵاتی خۆیان لە ئێران پەرە پێ بدەن و بۆ ئەمە شۆڕشێکیان بەدی هێنا و لە ساڵی ١٢٩٩ی هەتاوی‌دا رەزاخانی میر پەنج بە هێزی قوزاق هـاتە تاران و قوزاقەکان دەستیان کـردە ئـازاردانـی ئـازادی خـوازەکـان و خـەڵکیان

چەوساندەوە و ئەوسا پێچەیان لە سەر ژنان هەڵگرت و بەم هۆیەوە گەلێ لە ئازادی خوازەکان لە گۆشە و کەناری وڵاتدا راپەڕین و تەواوی ئەم بزووتنەوانە بە هۆی رەزاخانەوە سەرکوت کرا.

*****

**(٩)**

**رەسـتاخێز مـەبۆ، رەسـتاخێز مـەبۆ**
**یـاران بـزانـان رەسـتاخێز مـەبۆ**
**نـە دۆڵ داڵان هـەر هـۆهۆ مـەبۆ**
**یـانەی هـەرکـەس شـی رۆڵـە رۆ مـەبۆ**
**ژنـێ گـورد مـەیۆ جـە وێـژ کـوردان**
**مـەستێزۆ چـەنی شـا جـە سـەر هـەردان**
**پـەرێ حـەق رەم مـەستێزۆ جـە کـۆ**
**نـامش بـەرمەشۆ جـە سـەر داڵـەهۆ**
**«ئـوجاغ» ئـی ئـاخێز نـە شـاهۆ مـەبۆ**
**دەعـوای سـەرانـە و بـەرزە کـۆ مـەبۆ**

**واتـە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێتە دی، لە دێی دۆڵ داڵان قیژە و هاوار دێتە گوێ، بچیتە ماڵی هەرکەسێک دەنگی رۆڵەرۆ دێ، ژنێ نەبەز لە رەگەزی کوردان سەر هەڵئەدا، و لە سەر هەردان و کێوانا لەگەڵ شا شەڕ ئەکا، بۆ مافی خەڵک لە هەردان دا بەشەڕ دێ، ناوی لە دەور و بەری کێوی داڵەهۆدا بـەرز ئەبێتەوە، (وەجاخ) ئەم راپەڕینە لە دەوروبەری شاهۆدا روو ئەدا، لە دێی سەرانە و بەرزەکێو دێتە دی،

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئامارژەیە بە راپەڕینی قەدەم خێری فەیلی کە لە ئاخر و ئۆخری سەدەی سێنزەهەمی کۆچی‌دا لە ناوچەی پێشکۆ و پشتکۆی کرماشان دا لە بەرابەری رژێمی ملهوڕی رەزاخان‌دا راپەڕی و ئەو خەڵکی بۆ بەربەرەکانێ بانگ کرد و لە پاش ماوەیێک زۆربەی خەڵک چوونە ریزی لەشکرەکەی و رەزاخان فەرمانی سەرکوت کردنی خەڵکی داو خەڵکی پشتکۆ گەلێ لە سەربازەکانی شایانی کوشت و ئەم شەڕە تا پێنج ساڵ درێژەی خایاند و سەرئەنجام رەزاخان پیلانێکی بەکاربرد و ئەوەش ئەوە بوو قورئانێکی بۆ قەدەم خێر نارد و لە پشتی بەرگەکەی سوێندی خوارد کە ئەگەر دەست لە شەڕ هەڵگرێ ئەو ئەبەخشێ و لە بەر ئەوەی شەڕەکە درێژەی خایاند وگەلێ کەسیش کوژرابوو، قەدەم خێر ناچار دەستی لە شەڕ هەڵگرت و خۆی دابەدەستەوە و لە پاشاپیاوکوژان و نەسەقچیانی شا سەرۆکەکانی ئەو بزووتنەوەیان گرت و گەلێکیان لێیان کوشت و قەدەم‌خێریشیان خستە زیندان تاگیانی سپاردەگیان ئافەرین.

*****

(١٠)

رەســــتاخێز مــــەبۆ، رەســــتاخێز مــــەبۆ
یـــــاران بـــــزانـــــان رەســــتاخێز مــــەبۆ
یــــاران قــــڕ مــــەبۆ، یــــاران قــــڕ مــــەبۆ
خــــەڵک مــــوسڵمان یــــەکســــەر قــــڕ مــــەبۆ
پــــەی دەنگ بــــاقی چــــڕاچــــڕ مــــەبۆ
نــــەی ســــاڵ وەش دا بــــەهار بــــڕ مــــەبۆ

زوڵـم و زەڵاڵـەت بـەرز مـەو نـە شـاران
مـــەو وە رەســـتاخێز عـــێراق و ئـــێران
(ئـــوجاغ) فـــرسەتەن قـــەنبەر بـدۆ قـۆ
هـــەركەس نـــە سـەمتێ واچـۆ رۆڵـەڕۆ

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێتە دی، ئـەی یـاران خەڵک لە ناو ئەچێ، موسڵمانەکان بە جارێ لە ناو ئەچن، دەنگێ لە پڕ دێتە گوێ، لەمساڵە خۆشەدا بەهار وشک ئەبێ، زۆر و ستەم لە شارەکاندا پەرە ئەستێنێ، و لە ئێران و عێراق شەڕ دەست پێ ئەکا، (وەجاخ) دەرفەتە کە قەنبەر (خولامی هافی عەلی) بانگ هەڵێنێ، هەرکەس لە شوێنێک بڵێ رۆڵەڕۆ.

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

دیاردی‌یە بە شەڕی ئێران و عێراق کە لە دوای شۆڕش، رژێمی عێراق بە پـێی فەرمانی ئەمریکا و شێخە عەرەبەکان بـە تـەواوی هـێزیەوە هـێرشی هـێنایە سـەر ولاتەکەمان و شەڕێکی خوێناوی بەدی هێنا و لەم شەڕەدا زل هێزەکانی خۆرهەلات و خۆرئاوا و هەندێ لە ولاتەکانی‌تری ئوروپایی و دەوڵەتەکانی عـەرەب یـارمەتی رژێمی عێراقیان دا وگەلێ شوێنیان لە ئێران داگیرکرد و لە پاشا هەموو ئەو شوێنانەی کەگرتبوویان گرتیانەوە و شەڕی رژێمی عێراق بووە هۆی ئەوە شـێخ‌نشینەکـانی عەرەب بۆ خەڵک بناسرێن و لەم شەڕەدا گەلێ لە لاوان کـوژران و زیـانێکی زۆر گەیشتە هەر دوولا.

*****

## (۱۱)

رەســـتاخێز مـــەبۆ، رەســـتاخێز مـــەبۆ
یـــاران بـــزانـــان رەســـتاخێز مـــەبۆ

دەمـــدەم ســـەدایـــێ مـەیۆ نـەگـۆشم
شـــەربەت مـــەدۆ پـــێم وە زۆر مـەنۆشم
وە تـــــەنیا خـــەیاڵ فکـــر بـــاسشەن
چـــەرخ جـــیهانگیر راگـــەی راسشـــەن
یـــاران نـــە جـەنگێ خـەیلێ کـوشتە بـۆ
هـــوون وێـنەی لافـاو جـە زام رشـتە بـۆ
یـەک بـەلاَی عـەزیم پەی کـوردان مـەیۆ
ئـــی بـــەلاَ چـون دوو نـەهەردان مـەیۆ

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێتە دی، پەی دەرپەی دەنگێ دێتە گوێما، خواردنەوەم پێ ئەدا و بە زۆر ئەیخۆمەوە، بیر و رای ئەو هەر بە کەڵکەڵە و هەندێشەیە، مەبەستی گرتنی جیهان لە رێی راستە، ئەی یاران! لە شەڕێکدا گەلێ لە خەڵک ئەکوژرێن، و خوێن وەکوو سێلاو لە زەویدا ئەڕژێ، وەی و ئاپۆرێ گەورە بۆ کوردەکان دێتە خوار، ئەم وەیە وەکوو دووکەڵ لە کێوەکاندا بلاَو ئەبێتەوە

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئاماژەیە بە رووداوی بۆمباردومانی شیمیایی شاری حەڵەبجە لە لایەن رژێـمی بەعسی عێراقەوە. حەڵەبجە یەکێ لە شارە خنجیلانەکانی کوردستانە، شارەکە پڕ لە لێڕ و دار و دارستان و باخ و گوڵزار و بژوێن بوو، وکەوتبووە ناو دارستانێکی زۆر و زەبەندەوە و خەڵکەکەی پتر خەریکی کشت وکاڵ و مالاَتداری بوون، ئەم شارە هەر لە کۆنەوە زانستگە بووە و گەلێ پـیاوی گـەورەی وەکـوو نـالی مـۆردینی، نـالی شارەزووری، شەمسەدین شارەزووری، مەولانا خالد شارەزووری، وەلی دێوانـە، عەبدوڵلاَبەگی گۆران، لزاخانمی جاف، تایەربەگی جاف، وەسمان پاشا، مەحموود

پاشا و گەلێ ناوداری تری پێگەیاندووە و ئەم شارە لە ساڵی ٦١٣ی کۆچی دا بوومەلەرزەیێکی تێ کەوتووە و گەلێ لە خەڵکەکەی کوژراوە و پاشان مەغوولەکان هێرشیان کردووەتە سەری و گەلێ لە خەڵکەکەیان کوشتووە و عوسمانی یەکانیش لە گەڵ بەربەرەکانێ بێوچانی ئەواندا روو بەروو بوون و لە پاشان ئەم شارە چەندین جار کەوتووەتە بەر هێرشی رژێمی سەددامەوە هەتا لە رۆژی ١٣٦٦/١٢/٢٦ ی هەتاوی دا حەڵەبجە و دوجێلە و خورماڵ و سیروان و چەندین دێی تریش بە هۆی فرۆکەکانی عیراق یەوە بە بۆمبی شیمیایی بومباران کران و لە ئەنجامدا چەند هەزار کەسی بێ گوناه کوژران. رووداوی حەڵەبجە ژانێکە بە سەر لەش و گیانی هەموو کوردێک دا، رووداوێکی دڵتەزێنە کە هەرگیز لەبیر ناچێتەوە و چیرۆکێکی خەمناکە کە لەمەودوا دایکانی کورد بەرەبەرە بۆ کۆرپەکان و منالەکانیان ئەیگێڕنەوە و هاورێ لەگەڵ فرمێسک و ئاخ و داخ دا منداڵەکانیان پێ ئەگەیێنن تا لە بەرابەری ستەمکارانەوە راوەستن و مافی خۆیان بستێنن و تۆڵەی خۆیان لێ بکەنەوە.

*****

## (١٢)

رەستاخێز مەبۆ، رەستاخێز مەبۆ
یاران بزانان رەستاخێز مەبۆ
یاران هاتهاتەن، یاران هاتهاتەن
کوشتار و هژمەت دەنگ هاتهاتەن
مانگ هەفتەمین پەی غەزاماتەن
یەسرە یاران شاخوەشین واتەن
دوو سەری دنیا سەنگ بڕبڕەن
زولفەقار دیارەن دایم نە سڕەن

دڵــه خـــاس خــەیاڵ ویـــانه وێـــڵ گــەشت
دانــەی زولاڵ تـاو هـەسارەی کـۆی نـەشت

**واته:** راپەڕین دێته دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێته دی، ئـەی یـاران رۆژگارێکی شوومان لە بەرایە، ئەوە بزانن کە کوشت و کوشتار و بانگی ناڵە و گریان روو ئەدا، و لە مانگی حەوتەمی ساڵدا ئەم رووداوە رووی دا، ئەی یاران ئەم رازە شا خوەشین درکاندی، دوو هێتمی جیهان وەکوو بەردێکی بڕبڕ و تیژە، ئەوسا شمشێری زولفەقار لە چاوەکان ون ئەبێ، ئەی دڵ بیری چاک بکە توێشووی خۆت و بەهانە مەهێنە، و خوا بناسە تا ئەستێرەی کێوی نەجد بۆت هەڵبێ.

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئاماژەیە بە دوو هێتمی بوونی جیهان کە لە دوای شەڕی جیهانی دووەم جیهان بووە دوو هێتمی خۆر هەڵات و خۆر ئاواو لە لایەنی خۆرهەڵاتەوە رووس و دەوڵەتە ژێردەستەکانی ئورووپای خۆرهەڵاتی و لە لایەنی خۆرئاواوە ئەمریکا و دەوڵەتەکانی ئینگلستان و فەرەنسە و دەوڵەتەکانیتر لایەنگری بوون و خۆر ئـاوایـییەکـان و خۆرهەڵاتییەکان بە خۆر هەڵات وڵاتەکـانی پشـتی پـەردەی ئـاسنیان ئـەوت و رووسەکانیش بە دەوڵەتەکانی خۆر ئاوایی پەردەی ئۆرانیۆمیان ئـەوت و لە پـاشا وڵاتەکانی گچکە لە بەرابەری هێرشەکانی ئەم دوو هێتمە راوەستان و رۆژ بە رۆژ شەڕ و هەرا لەو وڵاتانەدا ئەهاتە دی بە تایبەت شەڕ کەوتە ئەو وڵاتانەی کە نەوتی تیا بوو ئێستاش هەروایە. یارسان کە دیاردی پێ کراوە یەکێکە لە سەرۆکەکانی یارسان کە لە ساڵەکانی (٤٠٦ - ٤٦٧ی کۆچی)دا ژیاوە کە زۆربەی پێشبینییەکانیان بـە ئـەو پەیوەند داوە و ئەویش خۆی گەلێ هۆنراوی بە زاراوەی گۆرانی هۆنیوەتەوە.

*****

## (١٣)

رەســــتاخێز مــــەبۆ، رەســــتاخێز مــــەبۆ
یــــاران بــــزانــــان رەســــتاخێز مــــەبۆ
نــــە سوّک مــەشرق قــال و قــیل مــەبۆ
تــــاجیکان غــــەریق دەریــای نــیل مــەبۆ
نــــە خــاک عــێراق تــەم و تــار مــەبۆ
زەلزەلەی عــــەزیم قــــەهر قــــار مــــەبۆ
کــەش و کــۆ و دەشت وێــنەی دوو مــەبۆ
ئــــانە گــــرد پــــەرێ زەڕ و ســــوو مــەبۆ
دوو دەریــــای عــــەزیم سیارەنگ مــەبۆ
گــوشادی نــە بــەخت عــالەم تــەنگ مــەبۆ

**واته:** راپەڕین دێته دی، ئەی یاران ئەوە بزانــن راپــەڕین دێــته دی، لە لایــەن خۆرهەلاتەوە غەوغا و هەرا پەیدا ئەبێ، و عەرەبەکان لە دەریای نیلدا نوقم ئەبن، تەم و تاریکی ولاتی عێراق دائەپۆشێ، بوومەلەرزەی گەورە و رق و قین لەو مەڵبەندەدا دێته دی، کێو و دەر و دەشت وەکوو دووکەڵی لێ دێ، هەمووی ئەم کارەساتە بۆ زێڕ و سوود روو ئەدا، دوو دەریای گەورە رەش ئەبێ، جیهان بەم فراوانییە بۆ خەڵکی تەنگ ئەبێ.

### لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئاماژەیە بۆ هێرشی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بۆ سەر ولاتی عێراق کە بە هۆی بەهانەی ئازادکردنی کووەیت و چەکی خۆکوژی لە زەوی و دەریاوە هێرشی بردە سەر عێراق و هەزاران کەسی کوشت و ئەم شەڕە کە لەم دەورەدا بێوێنەیە: گـیانی

هەزاران کەسی کردە قوربانی خۆی، ئەم شەڕەکە بە هۆی نەوت یا زیڕی ڕەش هاتە دی، ئەمریکا ئەیویست هێزی خۆی لە خۆر هەلاّتی ناوەراست دا پتەو کاتەوە و کوێت لەو وەرگرێتەوە و بۆ دووەم جاریش سەدام لە ناوببا و بەم بۆنەوە هێرشی بردە سەر خاکی عێراق و شارەکانی وێران کرد و رژێمی سەدامی لە ناو برد ئەو سەدامە کە هەزاران کوردی کوشت و هەزاران کوردی ئاوارە و دەربەدەر کرد و هەزاران ماڵی وێران کرد و بێ گومان ئەم ڕووداوە بووە هۆی لە ناو چوونی رژێمی سەدام و هیواداریین کە کوردیش بە مافی خۆی بگا.

*****

(١۴)

رەســـــتاخێز مـــەبۆ، رەســـــتاخێز مـــەبۆ
یـــــاران بـــزانـــان رەســـــتاخێز مـــەبۆ
ســـەرداریٚ نـــە مـــڵک ئـــێران تـــەور مـــەبۆ
ســـــلسلەی ســـــپاش لاوەروەر مـــەبۆ
بـــــەیتولموقەدەس چـــــراغـــان مـــەبۆ
تـــلووع نـــە زوڵـــمەت دەمـــاغان مـــەبۆ
ئـــەرز فـــەلەستین گـــرد ئـــازاد مـــەبۆ
مـــێرد مـــوسڵمان هـــەر دڵشـــاد مـــەبۆ
وادیـــــوسسەلام شـــــۆرشین مـــەبۆ
فـــتوور قســـاس جـــەنگ دیـــن مـــەبۆ

**واتە:** راپەڕین دێتە دی، ئەی یاران ئەوە بزانن راپەڕین دێتە دی، سەرۆکێ لە ولاّتی ئێراندا سەرهەڵئەدا، زنجیرەی لەشکرەکەی گەلێ بەهێز ئەبێ، بەیتولموقەدەس

چراخان ئەبێ، هەتاوی بەزەیی هەڵدێ و تاریکی لە ناو ئەچێ، سەراسەری فەڵەستین ئازاد و سەربەست ئەبێ، پیاوی موسڵمان هەر دڵشاد و دڵخۆش ئەبێ، لە بەغادا شین و شیوەن دێتە دی، و پیاوکوژان تۆڵەیان ئەسرێتەوە و شەڕی دین بەرپا ئەبێ.

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئاماژەیە بۆ ئازد بوونی فەڵەستین و بەیتولموقەدەس لە دەستی سەهیۆنیستەکان کە بێ گومان رۆژێک تەواوی موسڵمانان یەک ئەگرن و بە یارمەتی خوای مەزن فەڵەستین لە چنگی سەهیۆنیستەکان دەرئەکەن و فەڵەستینی یەکان کە ئێستا ئاوارەی وڵاتەکانی جیهانن ئەگەڕێنەوە نیشتمانەکەی خۆیان و بێ گومان پیاوکوژانی دەیریاسین و کەفەر قاسم بە سزای کردەوەی خراپیان ئەگەن، وەکوو چۆن سەلاحەدینی ئەیووبی لە پاش چەند ساڵ شەڕ و بەربەرەکانێ لەگەڵ سەلیبی یەکاندا فەلەستینی لە چنگاڵی ئەوان ئازادکرد و لە دوای گرتنی حوتین شاری بەیتولموقەدسی لێیان سەند و موسڵمانەکان دیسان چوونەوە مەڵبەندی باو و باپیرانیان. بە هیوای رۆژێک کە موسڵمانان فەڵەستین بگرنەوە و بە ئارەزووی دێرینی خۆیان بگەن.

*****

## (١٥)

رەستاخێز مەبۆ، رەستاخێز مەبۆ
یاران بزانان رەستاخێز مەبۆ
جەنگ خەیبەر بۆ، جەنگ خەیبەر بۆ
خرۆش بەغداد جەنگ خەیبەر بۆ
زیرەی زولفەقار شاخەی دووسەر بۆ
ئەستەموول بەرباد دەعوا یەکسەر بۆ

تــا تــوركی نــه رۆم بــخێزۆ وه قــار
ئـەژدەر گـوشاد بـۆ پـەرێ گـرد شاهمار
کــورد و تــورک یــاران نــەو رەسـتاخێزه
گــردیان وەن مــەون نــه ئـەو ستێزه

**واته:** راپەڕین دێته دی، ئەی یاران ئەوه بزانـن راپـەڕین دێـته دی، شـەڕێک وەکوو شەڕی خەیبەر پەیدا ئەبێ، خرۆشی شاری بەغدا ئەبێته هۆی سەرەتای ئەو شەڕە، زیرەی زولفەقار بەرز ئەبێتەوە، له شاری ئەستەموولا شەڕ و هەنگامه بـەرپا ئەبێ، تا تورکەکان له رۆم (تورکیه) به رق و قـین راپـەڕن، ئـەژدەرخـەرەکـان، قیژەکەکان دەرئەخەن، ئەی یاران لەو هەنگامەداکورد و تورك رائەپەڕن، هەموویان به شەڕ و هەرا سەر ئەکەون.

## لێکدانەوەی هۆنراوەکان

ئاماژەیه بۆ راپەڕینی خەڵکی تورکیه و له ناو بردنی نەریتی دیکتاتۆری ئەو وڵاته. ئاشکرایه که وڵاتی تورکیه له سەر پەیمانی ناتۆیه و تا ئێستا چـەندین بـڕیارنامەی لەشکری لەگەڵ ئەمریکادا مۆر کردووه که یەکێ لەو بڕیارنامەیه دروست کـردنی بنکەیێکی لەشکری له سنووری ئێران و رووس و عێراقه، هـەروەها ئـەلف و بـێی تورکی گۆڕاوه به ئەلف و بێی لاتینی و زۆربەی مزگەوتەکانی گەورەی کردووەته مووزەخانه و له یاسای بنەڕەتی ئەو وڵاتەدا ئیسلام به ناوی دین نەناسراوه و خەڵك مافی خوێندنەوەی قورئان و پەڕتۆکەکانی دینیان نیه و له ئازادی بێبەش بوون و تەنانەت کورده‌کان مافی ئەوەیان نیه که به زمانی خۆیان بخوێنن و بنووسن و جل و بەرگی کوردی لەبەر کەن و به رێ و رەوشتی خۆیان بجووڵنەوە دیاره که خەڵکی تورکیه رۆژێك به ئارەزووی خۆیان ئەگەن و نەریتی دیکتاتۆری له ناو ئەبەن.

*****

## فەرهەنگۆک:

**(ئا)**

**ئاتەش:** ئاور، ئاگر.

**ئاخێز:** هەڵسان.

**ئاراستە:** رازاوە.

**ئازار:** رەنج. نەخۆشی.

**ئاسیاو:** ئاش.

**ئاسیاوان:** ئاشەوان.

**ئاشکار:** ئاشکرا.

**ئاشۆ:** بشێوی. بشێوە.

**ئاشووب:** ئاشو.

**ئاڵە:** ئەسپی ئاڵ.

**ئامراز:** ئەمراز.

**ئاودرگە:** ئاودر. کەنداو.

**ئاوەژ:** ژیری، ئاریش.

**ئاهر:** ئاور.

**ئەور:** هەور.

**ئەوراک:** برسیەتی.

**ئی:** ئەمە.

**ئیسا:** ئێستە.

**ئینە:** ئەمە.

**(ب)**

**بابۆ:** باوک.

**بارام:** ئەستێرەی مریخ.

**بازی:** وازی، یاری، گەمە.

**بر:** وشک.

**برجیس:** ئەستێرەی مشتەری.

**بژیشک:** پزشک، دوکتور.

**بەتەر:** خراپتر.

**بەرز:** بڵند.

**بەرشۆ:** دەرچێ.

**بەگلەر:** بەگەکان.

**بەیۆ:** بێت.

**بێشۆ:** بێئەندازە.

**بێوەر:** بێبەر.

**(پ)**

**پاتشا:** پادشا.

**پای:** داوێنی.

**پای کۆ:** داوێنی کێو.

**پایماڵ:** پاماڵ.

**پرسام:** سامدار.

**پۆل:** تاقم، دەستە.

**پەرسان:** لێپرسین.

**پەرێ:** بۆ.

**پەی:** بۆ.

**پەیدابیەی:** پەیدا بوون.

**پیرۆز:** زاڵ.

## (ت)

**تازی:** تانجی.

**تەرکەش:** تیردان.

**تەریک:** جێی چۆڵ.

**تەشنە:** تینوو.

**تەم:** تاریکی.

**تێغ:** شمشێر.

## (ج)

**جام:** پیاڵە.

**جە:** لە.

**جە قاپی:** لە درگا.

**جەمشەت:** بزووتنەوە.

**جەنگ:** شەڕ.

## (چ)

**چابوک:** چالاک.

**چراغان:** چراخان.

**چشت:** شت، چت.

**چون:** وەک.

**چەنی:** لە گەڵ.

## (خ)

**خاس:** باش، چاک.

**خامۆش:** بێدەنگ.

**خاو:** خەو.

**خرۆش:** هاوار.

**خوار:** بێ دەسەڵات.

**خوفتە:** خەوتوو.

**خوین:** خوێن.

**خەشار:** پەست، لەچەر.

**خەیلێ:** زۆر، فرە.

**خێزۆ:** هەڵئەسێ.

## (د)

**دلێ:** ناو

**دوساق:** زیندانی.

**دێرین:** کۆن.

## (ر)

**را:** رێ.

**راگە:** رێگا.

**رۆ:** رۆژ.

**رۆزگار:** رۆژیار.

**رەستاخێز:** رۆژی پەسڵان.

## (ز)

**زارۆ:** منداڵ.

**زام:** زەوی.

**زگار:** خەمبار.

**زویر:** خەمبار.

**زەڕ:** زێڕ.

**زەڕێ:** تۆسقاڵێک.

**زێڵ:** دڵ.

## (ژ)

**ژار:** ژەهر.

**ژەن:** ژن.

## (س)

**ستارە:** ئەستێرە.

**ستوور:** ماڵات.

**سڵسڵە:** زنجیرە.

**سۆک:** لا.

**سوو:** سوود.

**سەروەش:** سەرخۆش.

**سیا:** رەش.

**سێڵاو:** لافاو.

## (ش)

**شکار:** راو.

**شۆڕشت:** شۆڕش.

**شەڵمە:** خەڵووز.

**شەم:** مۆم.

**شەمەیێ:** هەندێ.

**شین:** شیوەن.

## (ف)

**فرە:** زۆر.

**فرێ:** فرە.

**فەڕ:** شکۆ.

**فەرزەن:** رۆڵە.

## (ک)

**کام:** ئارەزوو.

**کناچە:** کچ.

**کۆ:** کێو.

**کۆس:** جۆرە تەپڵێکە.

**کەچ:** گیڕ، لار.

**کەردەی:** کردن.

**کەش:** کێو.

## (گ)

**گرد:** هەموو.

**گۆش:** گوێ.

**گەزاف:** لاف، درۆ.

**گەزەند:** زیان.

**گەس:** خراپ.

**گیر:** گرفتار.

## (ل)

**لوای:** رۆیشتن.

**لەو:** لێو.

## (م)

**مەزانۆ:** ئەزانێ.

**مەگێڵۆ:** ئەگەڕێ.

**مەوارۆ:** ئەبارێ.

**مێش:** مەڕ.

## (ن)

**نام:** ناو.

**نماز:** نوێژ.

**نەبەرد:** شەڕ.

**نەخچیر:** نێچیر.

**نێش:** چزە.

## (و)

**وارەم:** گەڕانەوە بۆ دوا.

**وەرین:** پێشوو.

**وەش:** خۆش.

**ویم:** بووم.

**وێژ:** رەگەز.

**وێنە:** وەکوو

## (هـ)

**هامیار:** هاوڕێ.

**هژمەت:** رق، قین.

**هوون:** خوێن.

**هەرا:** شەڕ.

**هەرد:** کێو.

**هەسارە:** ئەستێرە.

**هەڵمە:** گرپەی ئاور.

**هەموار:** لەبار، تەخت.

**هەنگام:** کات.

## (ی)

**یانە:** ماڵ، خانوو.

**یاوای:** گەیشتن.

**یووزنگا:** لەوەڕگە.